# ئەرکی شیعر لە ئەدەبی کوردیدا

## ساڵانی (١٩٢٠ – ١٩٥٨)

**نەسرین رەئووف ئیسماعیل**



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **ئەرکی شیعر لە ئەدەبی کوردیدا**
**کوردیدا (١٩٢٠-١٩٥٨)**
- **نووسینی:** نەسرین رەئووف ئیسماعیل
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** چیمەن حەسەنی
- **چاپ:** یەکەم ٢٠١٠
- **ژمارەی سپاردن:** ٩٢٠
- **نرخ:** ٢٠٠٠ دینار
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی رۆژهەڵات (هەولێر)

**زنجیرەی کتێب (٣٩٧)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com
ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەرۆک

# پێشەکی

پرسیارێك لەو پرسیارە گرنگانەی کە هەمیشە رووبەرووی هونەری شیعر کراوە، ئەو پرسیارەیە کە دەربارەی ئەرکەکەی کراوە و دەکرێت، هەربۆیە بەردەوام تێروانین و را و بۆچوون دەربارەی ئەو پرسیارە خراونەتە بەردەست و لێکۆڵینەوەی جۆراوجۆر دەربارەی بەئەنجام گەیەنراوە لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر ئەو پرسیارە دەکرێ و تێروانینی تر لەوەڵام دانەوەی دا گەڵاڵە دەکرێ.

دیارە شیعری کوردیش بەگشتی لە رووبەڕووبوونەوەی ئەو پرسیارە بێ بەش نەبووە، بەڵام وەك دەردەکەوێ کەمتر هەوڵی وەڵامدانەوەی دراوە مەگەر بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ نەبێ بەتایبەتی لەو لێکۆڵینەوانەدا کە دەربارەی بابەتی شیعری ئامادەکراوە، هەربۆیە بە پێویستمان زانی لێکۆڵینەوەکەمان رووبەڕووی ئەو پرسیارە بکەینەوە و هەوڵی وەڵامدانەوەیەکی زانستانەی بدەین بەتایبەتیش لە قۆناغێکی شیعری کوردی کە گەشەی دیاری بەخۆوە بینیوە کە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمە، هەر لێرەوە ناونیشانی لێکۆڵینەوەکەمان بەو شێوەیە دارِشت کە بریتی بێت لە ((ئەرکی شیعر لە ئەدەبی کوردی دا (١٩٢٠ — ١٩٥٨))) تابتوانین بەچەند بەشێك لەو ئەرکانە بکۆڵینەوە کە شیعری کوردی لەوقۆناغەدا بینیونی.

بەم پێیە لەبەشی یەکەمی لێکۆڵینەوەکەماندا کە بەناونیشانی (ئەرکی شیعر لەتیۆرە ئەدەبییەکاندا)یە، هەوڵی ئەوەمان داوە تێروانینی ئەدەبی میللەتانی تر لەقۆناغە جیاجیاکانیاندا کە راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان لەگەڵ ئەدەبی کوردی دا بەستووە دەربارەی ئەرکی شیعر بخەینە بەردەست بەتایبەتیش لە (ئەدەبی ئەورووپی و ئەدەبی عەرەبی و ئەدەبی فارسی و ئەدەبی تورکی)دا کە بۆ خۆیان کەم و زۆر کاریگەرییان لەسەر لایەنە جیاجیاکانی شیعری کوردی کردووە.

بەشی دووەمی لێکۆڵینەوەکەمان کە بەناونیشانی (ئەرکی شیعر لە ئەدەبی کوردی سالآنی پێش (١٩٢٠)) دایە هەوڵمان داوە بەپێی سەرهەڵدان و گەشەکردنی هونەری شیعر لەزارە



جیاجیاکانی ئەدەبی کوردی پێش ئەو قۆناغەی کە لێکۆڵینەوەکەمانی بۆتەرخان کراوە ئەو ئەرکانە دیاری بکەین کە شیعری کوردی بینیونی و بۆ خۆیان بوونەتە زەمینەی ئەرکی شیعر لە قۆناغەکانی دواتردا.

لەبەشی سێیەمی لێکۆڵینەوەکەماندا کە بەناونیشانی (ئەرکی شیعر لە ئەدەبی کوردی سالآنی ١٩٢٠ — ١٩٥٨) ە، سەرەتا بە پێویستمان زانی بە باسێکی تایبەت کە بەناونیشانی (ئەرکی شیعر لەرەخنەی کوردی دا)یە ئاوڕ لە را و بۆچوونی ئەدەبیانی کورد بدەینەوە دەربارەی ئەرکی شیعر لە قۆناغەکە خۆیدا چونکە ئەو تێروانینە رەخنەییانە کەم و زۆر کاریگەری خۆیان لەسەر ئەرکی شیعر لەو قۆناغە دا بەجێ هێشتووە، هەر لەم بەشەدا بە باسێکی تایبەت کە بەناونیشانی (ئەرکی شیعر لە دەقی شیعری قۆناغەکەدا)یە و بۆ خۆی کرۆکی لێکۆڵینەوەکەمانە هەوڵمان داوە ئەو ئەرکانە دیاری بکەین کە شیعری کوردی لەو قۆناغەدا بینوینی.

لەکۆتایی لێکۆڵینەوەکەشدا هەوڵمان داوە پوختەی ئەو ئەنجامانە بخەینە بەردەست کە لێکۆڵینەوەکەمان پێیان گەیشتووە.

ئەم کتێبە نامەیەکی ماجستێرەو بەشێکە لە پێویستییەکانی پلەی ماجستێر لە ئەدەبی کوردیدا، زانکۆی کۆیە، لە کۆلێژی زمان سالّی ٢٠٠٧ گفتوگۆی لەسەر کراوە.

## ١- ئەركی شیعر لە تیۆری ئەدەبی ئەورووپی دا

وەك ئاشكرایە ئەدەبی ئەورووپی بۆ خۆی لەسەر زەمینەی كەلەپورێكی دەولەمەندی دێرین بنیات نراوە كە ئەدەبی یۆنانی و رۆمانییەكانە، هەربۆیە ((ئەلیۆت)) دەڵێ : ((ئەوخوێنەی بەشادەمارەكانی ئەدەبی ئەورووپیدا دێت و دەچێت خوێنی ئەدەبی یونانی و رومانییە)) [1].

جا بۆ دیاركردنی ئەركی شیعریش لە ئەدەبی ئەورووپیدا پێویستە سەرەتا سەرنج لەو تێڕوانینانە بدەین كە دەربارەی ئەدەبی یۆنانی و رۆمانییە یاخود لەبازنەی ئەدەبی یۆنانی و رۆمانی دا سەریان هەڵداوە یان دەستە بەركراون.

### أ- ئەركی شیعر لە تێڕوانینی یۆنانییەكاندا:

وەك دەردەكەوێت هونەر لای یۆنانییەكان پابەندكرابوو بەهەموو چالاكییەكانی مرۆڤەوە هەرلەكار و پەروەردەكردنەوە بیگرە تا دەگاتە فەلسەفە و ئایین، بەم هۆیەشەوە بووە كە تیۆری ئیستاتیكی یۆنانی لەروانگەیەكی ڕەوشتییەوە لە هونەریان روانیوە و مامەلەیان لەگەڵدا كردووە.

بەم پێیەش ئەوەی زیاتر گرنگی پێدراوە ئەركی هونەرەكەبووە نەك خودی داهێنان خۆی، چونكە یونانییەكان بایەخیان بە بەدەست هێنانی مەعریفە داوە و بیری هونەری لەلایان راستەوخۆ ئاراستەی بەدیهێنانی ئەو ئامانجەكراوە كە فێركردنی مرۆڤە، هەر لێرەوە و لەسەدەی (٤ پ.ز) دا فەیلەسووفە یۆنانیەكان بانگەشەی ئەوەیان دەكرد كە شاعیر ناتوانێ ببێ بەمرۆڤێكی راستی گەیەنەر بەڵكو فەیلەسووف دەتوانێ ئەو ئەركە ببینێ. دیارترین فەیلەسووفیش كە ئەو هەڵوێستەیان راشكاوانە خستۆتە بەردەست، سوكرات و ئەفلاتوون بوون.

سوكرات ((٤٦٩ — ٣٩٩ پ. ز)) لەكاتی دادگایی كردنەكەیدا شاعیرانی بەوە تاوانبار كرد كە هەڵگری هیچ مەعریفەیەك نین و تەنانەت ناشتوانن دەربارەی شیعرەكانی خۆیان بدوێن [2]

ئەو تیروانینەی سوكرات بۆخۆی لای ئەفلاتوونیش ((٤٢٨ — ٣٣٧ پ. ز)) نەك هەردەبینرێت بەڵكو بۆتە هەوێنی سەرجەم تێڕوانینە فەلسەفییەكانی.

---

١- مدخل الى التاريخ الاداب الاوروبية، د. عماد حاتم، دار العربية للكتاب، ليبيا، تونس، ١٩٧٩ : ص ٦٥.

٢- قواعد النقد الادبي، لاسل ابرو كرومبي، ترجمة د. محمد عوض محمد، دار الشؤون الثقافية العامة (آفاق عربية) الطعبة الثانية، بغداد، ١٩٨٦ : ص ١٥.



بەلای ئەفلاتوونەوە بەرزترین ئامانج كە مرۆڤ هەوڵی بۆ دەدات مەعریفەی راستەقینەیە، جا پلە و پایەی هونەریش لێرەدا لەو روانگەیەوە دیاری دەكرێ كە تاچەند لەبواری ئەو مەعریفەیەدا دەتوانێ رۆڵ ببینێ، دیارە بەلاشیەوە مادام هونەر بۆخۆی لاسایی كردنەوەی سروشت و دیاردە هەستپێكراوەكانە ئەوا ناتوانێ مەعریفەیەكی راستەقینە بگەیەنێت و هەمیشە سێ هەنگاو لەڕاستیەوە دوورە، هەروەها بەڕای ئەفلاتوون شیعر هیچ سوودێك بەكۆمەڵ و وڵات ناگەیەنێت و شاعیر هیچ كردەوەیەكی بەسوود لەدوای خۆی جێ ناهێڵێت چونكە هیچ زانیارییەك دەربارەی راستی ئەو بابەتانە نازانێت كە لاسایی یان دەكاتەوە هەربۆیە روودەكاتە شاعیران و بەتایبەتیش (هۆمیرۆس) و ئەو پرسیارانەی ئاراستە دەكات: ((بۆ نموونە پرسیاریان لێ ناكەین كە بۆچی نەزانراوە لەبارەی یەكێكیان لەڕابوردوو یان لە ئێستا كە نەخۆشێكیان چارەسەركردبێت یان زانستەكەی بۆ قوتابییەكانی گواستبێتەوە... گوێ بگرە خۆشەویستمان هۆمیرۆس ئەگەر تۆ ئەو شێوازە دەزانیت كەوا لەخەڵك دەكات چاكتر یان خراپتر بن لەژیانی گشتی و تایبەتی ناوی ئەو وڵاتەمان پێ بڵێ كەبەسای تۆ فەرمانڕەواییەكەی چاك بووە، ئایا دەتوانی ناوی وڵاتێكمان بدەیتێ كە بەیاساكانی تۆ سوودمەند بووبێت.)) [1]

ئەفلاتوون لەبەردەوامی پرسیارەكانی لە هۆمیرۆس و شاعیرەكان زیاتر نموونەی ئەوە دەهێنێتەوە كە شیعر هیچ ئەركێكی نییە: ((ئایا كەس گوێی لەسەركەوتنی جەنگێك بووە كە بەهۆی ئامۆژگارییەكانی یان بەهۆی سەركردایەتی هۆمیرۆس لەو جەنگە سەركەوتنی بەدەست هێنرابێت... ئایا گوێمان لێ بووە كە هۆمیرۆس لەژیانی تایبەتی دا رێ پێشاندەر یان مامۆستای كەس بووبێت... ئەگەر بیتوانی با مرۆڤ، فێركات و كاروباریان باش بكات ئەوا خەڵكێكی زۆری بەدوادەكەوتن)). [2]

بەم پێیە و بەو تێڕوانینەی كە بە پێوانەی رەوشتی هونەر و ئەدەبی هەڵسەنگاندووە، چونكە بەلایەوە ئەدەب و هونەر نەك هەر سوود مەندنین بەڵكو زەرەر مەندن و تێكدەری دەروونی مرۆڤن: ((شاعیری لاسایی كەرەوە كاروبڕیارێكی خراپ دەگەیەنێتە دەروونی تاك، چونكە بەشە ناهۆشمەندییەكەی دەردەكەوێت كە تیایدا جیاوازی لەنێوان باش و خراپ ناكات)). [3]

---

١- جمهورية افلاطون، ترجمة، الدكتور فؤاد زكريا، دار الكاتب العربي للطباعة والنشر، القاهرة، ١٩٦٨: ص ٣٦٦.

٢- ه. س : ص ٣٦٧.

٣- ه. س : ص ٣٧٥.

هەر بۆیەش لەکۆتاییدا ئەفلاتوون بڕیاری ئەوە دەدات کە شاعیران لەکۆمارەکەی دەربکات چونکە شیعری لاساییکەرەوە ئامانجی تەنها چێژ بەخشینە.

دیارە هەر لای یۆنانییەکان و هەرلەبازنەی تیڕوانینە فەلسەفیەکاندا دەربارەی هونەر و ئەدەب بۆچوونەکانی ئەرەستۆش ((٣٨٤ — ٣٢٢ پ. ز)) نەك هەر گرنگن بەڵکو بەرەنگرێژکەری تیۆری ئەدەبی ئەورووپیش دادەنرێن بەتایبەتی لەو بەرهەمەیدا کەلەسەر ئاستی جیهانی بەناوی (هونەری شیعر) ناوبانگی دەرکردووە.

سەرەتا ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە کە ئەرەستۆ لەورد بوونەوە و لێکۆڵینەوە لەنموکانی ئەدەبی یونانی بەتایبەتی تراژیدیا و کۆمیدیاوە بەرەو گەڵاڵە کردنی کۆمەڵێك را و بۆچوون و تێڕوانین بۆتەوە کە بۆخۆیان بوونەتە دەستوور و پێوانەی هەڵسەنگاندنی کارە ئەدەبییەکانی یۆنان.

بەم پێیە ئەرەستۆ پرسیار لەوە ناکات کە ئەدەب یان هونەر هەبێت یان نەبێت بەڵکو پرسیاری سەرەکی لەلای ئەوەیە کە هونەر و ئەدەب وەك هەن سروشتیان چییە و چ ئەرکێك دەبینن، لەئاکامیشدا ئەو تێڕوانینەمان دەخاتە بەردەست کە ئەدەب و هونەر بەتایبەتی تراژیدیا ئەرکی پاك کردنەوەی دەروونی مرۆڤ دەبینن و هەردوو هەستی سۆز و بەزەیی لەلا دەگەیەنە ئاستی مام ناوەندی، هەروەك لەپێناسەی تراژیدیادا لەلای هاتووە و دەڵێ: ((تراجیدی لاسایی کردنەوەی کردەوەیەکی سەنگین و لەخۆیەوە تەواو پێگەیشتووە کە درێژییەکی دیاری هەیە و بە زمانێکی پاراو نووسراوە کە چەندین بابەتی هونەری تێدا هاتووە کە لەگەل بەشەکانی شانۆگەریدا دەگونجێن و ئەمەش هەمووی بەشێوەی درامی نەك بەگێڕانەوە ئەنجام دەدرێ و رووداوی وای تێدایە کە (بەزەیی) و (ترس) دەوروژێنێ و بەمەوەش (پاکبوونەوە) لەم دوو سۆزە دێتە دی))[1].

**ب — ئەرکی شیعر تێڕوانینی رۆمانییەکاندا:**

دیارترین و بایەخدارترین سەرچاوە بۆ بەدەست هێنانی زانیاری دەربارەی تیۆری ئەدەبی لای رۆمانییەکان بەگشتی و تێڕوانینیان بۆ ئەرك و ئامانجی شیعر بەتایبەتی کتێبەکەی هۆراسی ((٦٥ — ٨ پ. ز)) رۆمانییەکە بە (هونەری شیعر) ناوبانگی دەرکردووە.

---

١- هونەری شیعر، شیعر ناسی ئەرەستۆ، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە پێشەکی و پەراوێزی: عەزیز گەردی چ. گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤ : ل ٢٧.



بەلای ئەورووپییەکانەوە هەر بەو کتێبە گیانی ئەرستۆ گەیەنراوەتە ئەورووپییەکان.

هۆراس دەربارەی ئەرکی شیعر ڕای وایە کە ((مەبەستی شاعیران یان سوود بەخشینە یاخود لەزەت پێ گەیاندنە یان لەیەك کاتدا ئارەزوو بزواندن و لێکدانەوەی پەندەکانی ژیانە))[1].

وەك دەردەکەوێ هۆراس سێ جۆر ئەرك لەبەرهەمی شیعری و ئەدەبیدا دەبینێ کە ((چێژ بەخشین)) بەتەنیا ((سوود بەخشین)) بەتەنیا یان هەردووکیان پێکەوە واتا ((سوود و چێژ بەخشین)) پێکەوە لەدەقێکدا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو دەقانە رەت ناکاتەوە کە بەتەنها چێژ دەبەخشن و سوودێکی رەوشتی یان مەعریفی ناگەیەنن چونکە دەڵێ: ((دەبا ئەو داستانەی بۆ لەزەت پێ گەیاندن دانراون بەپێی توانا لە واقیعەوە نزیك بن))[2].

هەروەها ئەو بەرهەمانەش رەت ناکاتەوە کە تەنها سوود بەخش و چێژ بەخش نین چونکە دەربارەی ئەو بەرهەمانە دەڵێ: ((ئەگەر بتەوێ سوود ببەخشی شت بەکورتی بڵێ، تا مێشکی خەڵکی بەخێرایی و ئاسانی قسەکانت وەربگرێ و بە ئەمانەت لێ یان تێ بگات. هەرشتێك لە پێویست زیاتر بوو لە جامی ئەقلی پڕ بووەوە دەرژێ))[3].

لەگەڵ ئەوەشدا هۆراس ئەو بەرهەمانەی لاپەسندە کە هەر دوو ئەرکەکەیان تیا بەدی هێنراوە واتا چێژ بەخشین و سوود گەیاندن کە دیارە چێژ بەخشینەکە لایەنی جوانکاری دەقەکەیەو سوود بەخشینەکەش لایەنی رەوشتی و مەعریفی دەقەکەیە: ((ئەو کەسەی بۆ بەکەیف هێنان و سوود بەخشین بە خوێنەر شتی سوود بەخش و بەتام پێکەوە تێکەڵ ئەکات هەمووان ڕازی دەکات... ئا ئەمەیە ناوبانگێکی درێژخایەن بۆ خاوەنەکەی وەدەست دەهێنێ))[4].

بەڕای هۆراس وا پێویست دەکات لەکاتی دانانی قەسیدەیەکدا بابەتی بەپێز و پێویست لەکاتی گونجاوی خۆیدا بووترێ ((پێویستە لەسەر هۆنەری ئەو قەسیدە نایابەی دونیا بێ سەبرانە چاوەڕوانیەتی، ئەو شتە بڵێ کە پێویستە بوترێ و زۆرشت دوا بخات تاوەکو کاتی خۆی دێ...))[5].

---

١- هونەری شیعر، هۆراس، حەمید عەزیز کردوویە بە کوردی، چ (الزمان)، بەغدا، ١٩٧٩ : ل ٣٠.

٢- هـ. س : ل ٣١.

٣- هـ. س : ل ٣٠ — ٣١ .

٤- هـ. س : ل ٣١.

٥- هـ. س : ل ١٧.

هەروەها هۆراس پێی وایە ئەرکی هەر بابەتێکی شیعری وشە و سنوور و شێوازی نووسینی تایبەتی خۆی هەیە کەبەمە لەخاسیەت و بابەتەکانی تری جیادەکاتەوە: ((چۆن ناتوانرێ بابەتێکی کۆمیدیا بەشیعری تراجیدیا بنووسرێ ئاوەهاش خوانی نایستیس بێزی نایەت بەسروودەکانی ژیانی رۆژانە بگێردرێنەوە کەبۆ کۆمیدیا دەست ئەدەن. هەر قسەیەك جێی خۆی هەیە، دەبا شاعیرانیش ئەم سنوورە نەشکێنن))[1].

بەگشتی ئەو تێروانینانەی (هۆراس) بۆ خۆیان بوونە بنەمای تراجیدیا و کۆمیدیای ئەورووپی و بەدرێژایی سەدەکانی ناوەڕاست رێنماییکەری شاعیرانی شانۆگەری بوون لە ناوگەلانی ئەورووپادا.

**ت ـ ئەرکی شیعر لەسەردەمی راپەریندا:**

وەك لەمێژووی شارستانییەتی گەلانی ئەورووپادا بەدی دەکرێت لەدوای لەت بوونی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی رۆژهەلاتی و رۆژئاوایی تا رووخانی ئەو ئیمپراتۆرییە رۆمانییە رۆژهەلاتییە و داگیر کردنی پایتەختەکەیان کە (قوستەنتینی)یە بووە لەلایەن عوسمانییەکانەوە، سەردەمێکی تارادەیەك تاریك لەمێژووی گەلانی ئەورووپادا بەدی دەکرێت کەبە سەدەکانی ناوەڕاست ناوبراوە و لەو سەردەمەدا و لەژێر دەسەلاتی کەنیسە و رژێمی دەرەبەگایەتی دا تیشکە گەشەکانی هونەر و ئەدەبی یۆنانی و رۆمانی شارانەوە و هونەر و ئەدەب لە ژێر سایەی رۆشنبیری کەنیسە دا هێلرا بۆوە، بەم پێیەش تەنها ئەرك کەدەبوو هونەر و ئەدەب بیبینن ئەو ئەرکانە بووە کە کەنیسە رەنگی بۆ رشتبوون.

کەواتە لەسەدەکانی ناوەڕاستدا هیچ بایەخێك بەمرۆڤ و مرۆڤایەتی نەدەدرا چونکە بیرو بۆچوون و تێڕوانینیی فەیلەسوف و رۆشنبیران : ((تەنها ئاراستەی ژیانی ئایینی کراوەو ژیانی دونیایی فەرامۆش کراوە))[2]. هەر لەم روانگەشەوە سەیری ئەدەب و هونەریان دەکرد و مامەلەیان لەگەلدا دەکرد.

١- هـ. س : ل ١٩ .

٢- التاريخ الاوروبي الحديث من عصرالنهضة الى مؤتمر ڤينا، د. عبدالحميد البطريق، الدكتور عبدالعزيز نوارة، دار النهضة العربية، بيروت، لبنان : ص٣٢.



لەئاکامی ئەم بۆچوونانە و وەکو بەرپەرچ دانەوەیەك بۆیان کۆمەلێك رۆشنبیرو نووسەر بەناوی ((هیومانیزم)) سەریان هەلدا، هەندێك لەو نووسەرانە وەك (رۆنساردو دۆبلیێ و دۆرا). سەرەتا بزووتنەوەی هیومانیزم لە ئیتالیا سەری هەلدا ئینجا بەرەو ولاتانی تری ئەورووپا هەنگاوی هاوێشت، ئەمانە بایەخێکی زۆریان بەخودی ئادەمیزاد دەدا و کاری لێکۆلینەوە و دراسەکردنی بیر و بۆچوونی کۆنی رۆشنبیرانیان ئەنجام دەدا و هەولیان دەدا: ((لاسایی رێگەو شێوازی نووسەرانی کۆن بگرنە بەر))[1] .

بەبڕوای هیومانیزم زمانی نەتەوەیی توانای ئەوەی نییە کەتەعبیر لە بیر و بۆچوونی ورد و قول بکات، بۆیە نووسەرانی سەر بەم بزووتنەوەیە بەرهەمەکانی خۆیان بەزمانی لاتینی دەنووسییەوە.

هەروەها ئەمانە بڕوایان بەتوانای ئادەمیزاد هەیە بەوەی کە دەتوانێ گۆڕانکاری لەژیاندا دروست بکات.

جا هەر لەگەل سەرهەلدانی سەردەمی راپەریندا و لەگەل هەلتەکاندنی رۆشنبیری کەنیسەدا و کردنەوەی بواری فیکری و مەعریفی جیاجیا لەبەردەم هونەرمەندان و ئەدیباندا ئەرك و ئامانجی شیعریش لەو بازنە تەسکە دەهێنرا دەرەوە و ئاسۆیەکی فراوانیان لەبەردەمدا کرانەوە.

بێگومان سەردەمی راپەرین هەروەك چۆن کۆمەلێك زاناو نووسەر و ئەدیب بەشدارییان کرد لە رەنگ رشتنیدا هەر بەو جۆرەش کۆمەلێك ئەدیب و رۆشنبیر و هونەرمەندی گەورەی دروست کرد.

یەکێك لەدیارترین نووسەرانی ئەو سەردەمە (دانتی) (١٢٦٥ – ١٣٢١ ز) بوو، کە چ لەبەرهەمەکانیدا و چ لەتێڕوانینە ئەدەبییەکانیدا هەولێدەدا بوارێکی نوێ لەبەردەم ئەدەبدا بکاتەوە و گەشەی تەواوی پێ بدات، سەرەتا بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە پێویستە لەبری زمانی لاتینی زمانی ئیتالی بەکاربهێنری، ئەم بانگەیەشی بۆخۆی نەك هەر رێگا خۆشکەر بوو لەبەردەم زمانی ئیتالیدا بەلکو بۆ زمانەکانی تری گەلانی ئەورووپا کە جێگەی زمانی لاتینی بگرنەوە و ببن بە زمانی ئەدەبی ئەم گۆڕانکارییەش بۆ خۆی گۆڕانێکی گرنگ بووە لە مێژووی ئەدەبی ئەورووپیدا تا لەو بازنەیەدا روو لە داهێنانی گەورە بکەن هەروەك لای دانتی و بۆکاشیۆ بەدی دەکەین، هەر لەلای دانتی دەبینین کە داوای ئەوەی دەکرد و هەولی دەدا کە

١- هـ. س : ص ٣٣.

((ئەدەب لەو چوارچێوە ئەکادیمیاییی یە تەنگەبەرەکەی سەدەی ناوەڕاست دەرباز بکا و بەتاقی کردنەوە سەلماندی لە تواناداا هەیە مەسەلە واقیعییەکانی ژیان بەشێوازێکی ئەدەبی بە زمانی جەماوەر لەخەڵك بگەیەنرێ)) [1]. هەر ئەم تێڕوانینانەشی لە ((کۆمیدیای یەزدانی))یەکەیدا رەنگی داوەتەوە و وشیارانە ئەرکی کۆمەڵایەتی و نیشتمانی و سیاسی پێ دەبینێ هەر بۆیە دەوترێ: ((ئەو شاکارەی دانتی ناوەڕۆکێکی قوڵی نیشتمانیی هەیە و بەئاشکرا تەعبیر لە بوونی نەتەوەیی گەلی ئیتالیا دەکات و خەون بە یەکێتی ئیتالیاو نەهێشتنی شەڕ و ناکۆکی ناوخۆییەوە دەبینێ و دەیەوێ دەسەڵاتی دونیایی لەدەست پاپاکان وەربگرێتەوە)) [2].

هەر لەو سەردەمەدا پەترارك ((١٣٠٤ — ١٣٧٤ ز) لە بەرهەمەکانیدا ((داوادەکات دەست بەرداری ناکۆکی و دووبەرەکی بن)) [3]. لەلایەن خۆشیەوە کە شەیدای ئەدەبی کۆن بوو ((لێکۆڵینەوەی لەبارەی کەلەپووری کۆن ئەنجام دەدا و نزیکەی دوو سەد دەستنووسی کۆکردبووەوە و لەلای خۆی دەی پاراست)) [4] بەم پێیە ئەمیش بەرهەمی ئەدەبی بەرەو بەدیهێنانی ئەرکی سیاسی و نیشتمانی دەبرد.

هەر لەناو نووسەرە دیارەکانی ئەو سەردەمەدا ناوی بۆکاشیۆ ((١٣١٣ — ١٣٧٥)) بەگەشی دەبینرێ بەو پێیەی لەلایەك بەبنیاتنەری هونەری چیرۆکی کورت دادەنرێ و لەلایەکی ترەوە بە رەخنەگرێکی نەترس لەپیاوانی کەنیسە خۆیمان پیشان دەدات بەتایبەتی لە ((دیکامیرۆن))ەکەیدا دەردەکەوێت کە چۆن: ((هەنگاوێکی چاونەترسانەی نا بۆ ئاشکراکردنی رووی راستەقینەی پیاوانی کەنیسە.. ناوەرۆکی چیرۆکەکانی پڕن لە نموونەی زیندوو، بەجۆرێك دەڕوانێتە ئادەمیزاد کە داهێنەرێکی گەورەی ژیانە و پێویستە لەشوێن و جێگای شیاوی خۆیدا دابنرێ.)) [5].

١- رێنیسانس، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، فوئاد میسری کردوویە بە کوردی، چ. الحوادث، بەغدا، ١٩٨٤ : ل ٩٤ — ٩٥ — ٩٦.

٢- هـ. س : ل ٩٩.

٣- هـ. س : ل ١٠٩ .

٤- اوربا العصور الوسطى، النهضات والحضارة والنظم، الجزء الثاني، دكتور سعيد عبدالفتاح عاشور، الطبعة العاشرة، مكتبة الانجلو المصرية، ١٩٨٦ : ص ٢٠٣.

٥- رێنیسانس، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد : ل ١١٥ — ١١٦.



بۆکاشیۆ لەم شاکارەی دا بەشێوازێکی گاڵتەجاڕییەوە پەردە لەسەر رەفتار و هەڵسوکەوتی پیاوانی کەنیسە هەڵدەداتەوە و وشیارانە گوزەرانی چینی بۆرژواو ئوروستوکراتی کە بە مافی خواردنی هەژاران تاوان باریان دەکات، دەخاتە ڕوو.

دیارە بەرهەمی ئەم نووسەرانە و دەیان نووسەری تری سەردەمی راپەڕین رێگایان لە بەردەم چەکەرەکردنی ئەدەبێکی نوێ دا کردەوە، زۆربەشیان بەرهەمەکانیان بەو بوارەدا ئاراستە دەکرد کە ئەرکی کۆمەڵایەتی و رەوشتی پێ ببینن و لەسەر ئازادی تاك پێ داگرن و داکۆکی لە مافی تاکەکەس بکەن.

## پ – ئەرکی شیعر لە قۆناغی کلاسیکی نوێدا :

هەر سەردەمی راپەرین بۆخۆی ئەو زەمینە لەبارەی دروستکرد کە رێبازی کلاسیکی نوێ لە ئەدەبی ئەورووپیدا دروست ببێت و بۆ ماوەیەکی زۆر لە مێژووی ئەدەبی ئەورووپیدا کاریگەری خۆی بەجێ بهێڵێ.

وەك ئاشکرایە بەرهەمی سەربەم رێبازە شیعری شانۆگەری بووە هەر بۆیە کە باس لە ئەرکی شیعر دەکەین لای کلاسیکیەکان دەبێت ئەو راستییە فەرامۆش نەکەین کە شیعری شانۆگەری بۆخۆی هەڵگری بەدیهێنانی ئەو ئەرکانە بووە کە ئەرەستۆی یۆنانی رەنگی بۆ رشتبوو، دیارترین ئەرکیش کە پاککردنەوەی دەروونە لە هەردوو هەستی ترس و بەزەیی بۆخۆی و لەو قۆناغەشدا ئەرکێکی کۆمەڵایەتی شیعر بووە و لەڕووی رەویشتیەوە بەدیهێنەری بواری چاکە خوازی بووە لەناو کۆمەڵدا.

دیارترین سیما و شەقلی شیعری کلاسیکی ئەورووپی هەروەك دکتۆر ((دلشاد عەلی)) دەڵێ: ((ئەوەیە کە هەڵگری بەها مرۆڤایەتییەکان و ئەو هەست و تێڕوانینە مرۆڤایەتییانە بوونە بنەڕەتێك لەبنەڕەتە گرنگەکانی، تەنانەت خاسیەتێکی هەرە دیاری رێبازە کلاسیکییە ئەوروپییەکە خاسیەتی گەرانە بەدوای ڕاستیەکانی دەروونی مرۆڤایەتی دا و بەلاشیانەوە ئەو راستییانە بۆخۆیان هەڵێجراوی تاقی کردنەوە خودی و کەسییەکانی شاعیرن وەك ئەوەی شکست هێنانی مۆلێر لەژیانی خێزانیدا بووە هۆی ئەوەی کەسەرکەوتوانە باس لەپیاوی هەڵخەڵەتێنراو بکات و زۆری ئافرەتانی ژیانی راسینیش وای لێ کردووە کە قووڵتر باس لەخۆشەویستی و دڵداری بکا)) [1].

١- دەستنووسێکی بڵاو نەکراوەی د. دلشاد عەلی، رێبازی کلاسیکی لە ئەدەبدا تێڕوانین و هەڵسەنگاندن.

كەواتە باسە خودی و كەسایەتییەكانیش لەچوارچێوەی ژیانی كۆمەڵایەتی دا خراونەتە ڕوو تابتوانن ئەركێكی مرۆڤانە و كۆمەڵایەتی پێ بەدی بهێنرێن.

هەر لێرەوە كاتێ باس لەبایەخدانی ڕێبازە كلاسیكییە ئەورووپی یەكە دەكرێ بەوەی بایەخی بەلایەنی جوانكاری داوە ئەبێ ئەو ڕاستییە فەرامۆش نەكرێ كە ئەو بایەخدانە بەلایەنی جوانكاری لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجە مرۆڤایەتییەكاندا بووە، ئەم چەشنە ئەرك بینینەش لەشیعری شانۆگەری ئاساییە چونكە خودی ئەم جۆرە شیعرە بۆ خۆی كە بابەتییە نەك خودی بەرەو بەدیهێنانی ئەركە كۆمەڵایەتی و ڕەوشتییەكان دەچێت. هەر بۆیە بوالۆ ((١٦٣٦ – ١٧١١)) ڕەخنەگری كلاسیكی پێی لەسەر ئەوە دادەگرت كە دەبێت شاعیران گرنگی بە دیاردە ماقول و گشتییەكان بدەن و لە دیاردەی شێواو و نامۆ دوور كەونەوە.

هەر لە ڕێبازە كلاسیكییەكەدا نابێ ئەوەمان لەیاد بچێ كەنەك هەر تراجیدیاكان هەڵگری بەها مرۆڤایەتییەكان بوون بەڵكو شانۆگەرییە كۆمیدییەكانیش هەڵگری شەقڵێكی قووڵی مرۆڤانە بوون وەك لەبەرهەمەكانی (مۆلێر) دا بەدی دەكەین كە ڕاستەوخۆ ڕوویان لەزاخاو دانەوە و چاك كردنی ڕەوشت و نەریتی كۆمەڵایەتی كردووە لەرێگای گاڵتە پێ كردنەوە.[1]

لای (كۆرنێ)ش بەتایبەتی لە شانۆگەری (سید)ە كەیدا ئەو تێڕوانینە ڕەوشتییە دەخرێتە بەردەست كە (خۆشەویستی بۆخۆی چاكەیە و لە سەرچاوەیەكی چاكە خوازەوە هەڵقوڵاوە هەر بۆیە خۆشەویستی و ڕەوشت بەرزی پێكەوە گرێدراون و یەكتری تەواو دەكەن)[2].

لای (ڕاسین) یش كێشەی نێوان ئەركی سەرشانی مرۆڤ بەرامبەر بەنیشتمان و بەرژەوەندی تایبەتی دەبنە یەكێك لە بابەتە شانۆگەرییەكانی بەناوی (((بیرینیس)ە كە لە ساڵی (١٦٧٠) دا نمایش كراوە)).[3]

بەم پێیە دەگەینە ئەو ڕاستییەی كە شاعیرانی كلاسیكی دەیانویست بە بەرهەمەكانیان ئەو ڕاستییە بخەنە ڕوو كە : (ڕەوشتی نوێ مرۆڤانە تر بووە لە ڕەوشتی كۆن بەمەش دژی پیرۆز

١- بروانه الكلاسيكية في الاداب والفنون العربية والفرنسية، د. ماهر حسن، د. كمال فريد، الطبعة الثانية، مكتبة الانجلو المصرية، القاهرة : ص ٨٥.

٢- هـ. س : ص ٧٧ – ٧٨.

٣- المذاهب الادبية، د. جميل نصيف التكريتي، الطبعة الاولى، دارالشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٠ : ص ٩١.



ڕاگرتنێكی كوێرانەی خانەدانی بنەماڵەكان بوون كە پەیوەندییە مرۆڤایەتییە سروشتییەكانی تێك دابوو)[1].

كەواتە شاعیرانی سەربەم ڕێبازی كلاسیكییە كە ڕاستەوخۆ بەرهەمەكانیان لە پێناو بەدی هێنانی ئەركی نیشتمانی و كۆمەڵایەتی و مرۆڤ پەروەری ئاراستە كردووە، واتا ئەگەر لەڕووی جوانكاری و سەنعەتەوە بایەخیان بەدەقەكان دابێت ئەوا لە پێناوی بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەدا بووە.

## ج - ئەركی شیعر لە ڕێبازی ڕۆمانتیكی دا:

ئاشكرایە كە كەم نووسەر هەیە ئەو ڕاستییەی نەخستبێتە بەردەست كە هێندەی نووسەرانی ڕۆمانتیكی خۆیان دەكرێت چەمكی جیاجیا و جۆراوجۆر بۆ ڕۆمانتیكییەت دیاری بكرێت واتا: ((دیاریكردنی سروشت و ئەرك و سیما و شەقڵەكانی ئەم ڕێبازە هێندە چەسپاو و سنووردار و دیاریكراو نین كە بەئاسانی كۆبكرێنەوە و دەستنیشان بكرێن)).[2]

لەگەڵ ئەوەشدا بۆ ئەو لایەنانەی كە ئێمە مەبەستمانە دەربارەی ئەركی شیعر لەم ڕێبازەدا ئەوا دەتوانین ڕاستییە دیارەكان دەستنیشان بكەین و لێیان بدوێین، یەكێ لەو ڕاستییانەش ئەوەیە كە ((ڕۆمانتیكەكان بە گشتی بایەخیان بە ((مرۆڤ و یاسا)) و ((مرۆڤ و ژینگەی كۆمەڵایەتی)) داوە و ئەم كێشانە بوونەتە تەوەری كارە ئەدەبییەكانیان بەلای ڕۆمانتیكەكانەوە هۆكاری بەدبەختی مرۆڤ لە ئاكامی دژایەتی نێوان كەسێتییەكەی و دەوروبەرە كۆمەڵایەتییەكەیدا پێك دێت، هەروەها لە نەگونجانی ئازادی ڕاستەقینەی تاك لەگەڵ دەوڵەت و ژینگە بەرتەسكەكە ناهەموارەكانی سەردەردێنن، هەر بۆیە ڕۆمانتیكییەت بەرپەرچ دانەوەیەكی تاكەكەسی بووە دژی دەسەڵاتی سیاسی كۆمەڵ، بەچوونە ناو ئەم كێشانەشەوە ڕۆمانتیكییەت ڕەنگی بەسەردەمەكەی خۆی داوەتەوە هەر بۆیە دەكرێ بڵێین ئەركێكی دیاری ئەم ڕێبازە ڕەنگ پێدانەوەی كێشە كۆمەڵایەتی و سیاسییەكان بووە لەڕوانگەی تاكەكەسەوە)).[3]

١- هـ. س : ص ٨٠.

٢- الرومانتيكية، الدكتور محمد غنيمي هلال، دار العودة، بيروت، ١٩٨٦: ص ٧.

٣- المذاهب الادبية، د. جميل نصيف التكريتي: ص ١١٧

هەر ئەم بایەخدانە بەتێڕوانینی تاکەکەس ڕێگای بۆ ئەوە خۆشکرد کە شیعری لیریکی دیارترین بەرهەمی ڕۆمانتیکەکان بێ لەم جۆرە شیعرەشدا دەربڕین لەهەست و سۆزی تاك بووە سیمای دیاری ئەم چەشنە شیعرە.

جا ڕاستەکە شیعری ڕۆمانتیکی خودییە و وەك کلاسیکی بابەتی نییە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە کێشەو بەها کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکان دانەبڕاوە، هێندە هەیە لەڕوانگەی سۆزی خودییەوە لەو کێشەو بەهایانە ڕوانراوە نەك لە ڕوانگەی عەقڵەوە وەك ڕێبازە کلاسیکییەکە، هەر ئەم چەشنە مامەڵە کردنەی ڕومانتیکییەکان بووە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتییاندا بەو ڕادەیەی کە : ((بەرهەمەکانیان بە ئاوێنەی جیهان و تابلۆیەکی سەردەم ناوبرێن)) [1] و دوو ڕێچکەی دیار لەڕۆمانتیکییەت دیاری بکرێن کە ڕۆمانتیکییەتی کۆنەخواز و پێشکەوتن خوازە.

شیعر لای ((شیللی)) بەتایبەتی لە قەسیدەی ((چیای سپی)) ئەرکی پێشاندانی ((هاوکاری خود و بابەت و هەروەها تێکەڵ کێشکردنیان)) [2] دەبینێ.

((بایرون))یش هەروەکو شاعیرانی تری سەردەمەکەی خۆی عەشقی جوانی سروشت بووە، بۆیە بەراوردی لەنێوان: ((سۆزەکانی مرۆڤ و بەدبەختی و جوانییەکانی سروشتی هێمنی بێ باك)) دا [3] کردووە.

هەر لەپاڵ ئەم ڕاستییەدا کە ڕۆمانتیکەکان ((هەڵگری پەیامێکی مرۆڤانە بوون)) [4] ڕاستییەکی تر دێتە بەردەستمان ئەویش ئەوەیە کە هەندێك لە شاعیرانی ڕۆمانتیکی هەبوون پێیان لەسەر ئەوە داگرتووە کە شیعر خۆی مەبەستە نابێتە هۆکارێك بۆ بەدی هێنانی مەبەستێکی تری ڕەوشتی یان کۆمەڵایەتییان زانستی هەر بۆیە ئەم شاعیرە ڕۆمانتیکییانە لەبازنەی ((هونەر بۆ هونەر)) دا دەبینرێن کە دیارترینیان ((بۆدلێر))ەو دەڵێ : ((شیعر خۆی ئامانج و مەبەستە و هیچ مەبەستێکی تری نییە جگە لەخۆی هیچ شیعرێکیش لەو شیعرە مەزنتر نییە کەلە پێناوی چێژ وەرگرتن لە نووسینی دا دەنووسرێ، لێرەدا مەبەستم لەوە نییە

١- هـ. س : ص ١٧٥ .

٢- مفاهيم نقدية، تأليف رينيه ويلك، ترجمة د. محمد عصفور، ١٩٨٧: ص ١١٩.

٣- هـ. س : ص ١٢١.

٤- الرومانتيكية، الدكتور محمد غنيمي هلال: ص ٢٠٤.



کە بڵێم شیعر ڕەوشت بەرز ناکاتەوە یان مرۆڤ بەرەو مەبەستی بەرزتر نابات بەڵکو دەمەوێ بڵێم شیعر وەك زانست و وەك ڕەوشت نییە و ئامانجی شیعر گەڕان نییە بەدوای ڕاستید بەڵکو خۆی ئامانجە))[1].

هەر لەپاڵ بۆدلێر دا ((تیوفیل جویتیە)) دەڵێ: ((ئەڵێن سوودی شیعر چییە ؟ سوودەکەی ئەوەیە کە جوانە ئایا ئەمە بەس نییە وەك گوڵ و بۆن و هەموو ئەو شتانەی کە مرۆڤ ناتوانێ بە بەکارهێنانی خراپی بکات، دیارە هەموو شتێکیش بەعادەتی جوان نییە ئەگەر سوودمەند بێت)) [2].

هەر لێرەوە ئەم چەشنە تێڕوانینانە بۆ شیعر لەناو چوارچێوەی ڕێبازی ڕۆمانتیکی دا ڕێگەیان خۆشکرد بۆ سەرهەڵدانی ڕێبازی پەرناسی و ڕەمزی لە ئەدەبی ئەورووپیدا.

## ح- ئەرکی شیعر لە ڕێبازی پەرناسی دا:

بنەما گشتییەکانی ڕێبازی پەرناسی ئەو ڕاستییە دەخەنە بەردەستمان کە ئەو ڕێبازە بۆ خۆی ڕاستەوخۆ ڕێچکەی هونەر بۆ هونەری گرتۆتە بەر و بەلایانەوە ئەمان پێچەوانەی ڕۆمانتیکەکانن کە شیعریان لە ئاسمانەوە هێنایە خوارەوە واتا نزمیان کردەوە بۆ سەر زەوی و ئەمان گەڕاندیانەوە بۆ لوتکە و دووریان خستەوە لەزەوی و لەکێشەکانی سەر زەوی، هەر بۆیە ((تیوفیل گوتییە)) کە ڕابەرێکی ئەم ڕێبازە بووە دەڵێ: ((هونەر لای ئێمە ئامراز نییە بەڵکو ئامانجە))[3].

هەروەها شاعیرێکی تری سەربەم ڕێبازە کە ((لیکونت دی لیل))ە دەڵێ: ((بەهای هونەر لە جوانییەکەی دایە، لەشێوەکەیدایە نەك لە سوودەکەیدا)) [4].

١- هـ. س : ص ٢٠٥.

٢- هـ. س : ص ٢٠٦.

٣- الخلاصة في مذاهب الادب الغربي، د. علي جواد الطاهر، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣ : ل ٣٦ — ٣٧.

٤- هـ. س : ل ٣٨.

لەپال ئەو دوو شاعیرەدا گەلێ شاعیری تر لەو بڵاوکراوەیەدا کە بە ناونیشانی ((پەرناسی هاوچەرخ)) لەساڵی (١٨٦٦) دا بەرهەمیان بڵاو کردۆتەوە لەوانە: بودلێر، شیللی پلود روم و رامبۆ و مالارمییە.

دیارە هەموو ئەمانەش لەو قۆناغەی مێژووی ئەدەبی ئەوروپیدا لەبازنەی ((هونەر بۆهونەر)) دا کاریان دەکردو هەموو ئەرکێکی رەوشتی و کۆمەڵایەتی و سیاسییان لەئەدەب و هونەر دادەماڵاند [1].

لێرەشدا نابێ ئەوەمان لەیادچێ کە لە مێژووی ئەدەبی گەلانی ئەورووپادا پەرناسی بەو رێبازە دەوترێ کەلە سەردەمی سەرهەڵدانی رێبازی ریالیزمدا رووی لەشیعر کردووە، لەکاتێکدا خودی رێبازە ریالیزمییەکە لەبواری پەخشاندا دوای رۆمانتیکییەت سەری هەڵدا و لە ناوەراستی سەدەی نۆزدەدا بووە رێبازێکی دیارو بەربڵاوی ئەدەبی ئەورووپی هەر بۆیە ئێمەش لێرەدا روو لە رێبازی ریالیزم ناکەین بەو پێیەی کە بەرهەمی سەر بەم رێبازە پەخشانە نەك شیعر.

## خ - ئەرکی شیعر لە رێبازی رەمزی دا:

زۆربەی شاعیرانی سەر بە رێبازی پەرناسی روویان کردە رێبازێکی تری ئەدەبی لەسەدەی نۆزدەهەمدا کە ئەویش رێبازی رەمزی بوو هەر بۆیە دەکرێت هەر لەسەرەتاوە ئەو راستیە یەکالاّ بێتەوە لەبەردەستا کەرێبازی رەمزیش لەبازنەی هونەر بۆ هونەرەکەدا سوڕاوەتەوە.

هەربۆیە ئەوەی دەربارەی ئەرکی شیعر لای رەمزییەکان دەبینرێ ئەوەیە کە بەلایانەوە ئەرکی شیعر پیشاندان و گواستنەوەی وێنەی واقیع و راستی نییە بەڵکو بارێکی دەروونییە کە بە کۆتایی هێنان بە گواستنەوەی واقیع خۆی دەردەخات، بەم پێیە ئەرکی شیعر دەبێتە پێکهێنانی پردێکی ویژدانی لەنێوان داهێنەر و خوێنەردا، بەگشتی ئەرکی شیعر لای رەمزییەکان بەدی هێنانی جوانی بووە جا با بەلایەنە رەوشتی و کۆمەڵایەتییەکانیش دژوار بوو بێت هەر ئەمەش وای لێ کردن کە بەرامبەر دیاردەی رێنمایی کردن و ئامۆژگاری بوەستن: ((راستی هونەر بەلای رەمزیەکانەوە مەزنتر و بەرزترە لە ڕاستییە رەوشتی و کۆمەلایەتییەکان)) [2].

١- بڕوانە مذاهب الادب الغربي، تأليف د. سالم احمد الحمداني، مطبعة التعليم العالي ، موصل، ١٩٨٩: ل ٣٠٩ — ٣٢٢.

٢- مذاهب الادب الغربي : ل ٢٢٣ — ٢٦٣، هەروەها بڕوانە: ڕێبازە ئەدەبییەکان، ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە فەڕەنسییەوە د. فەرهاد پیربال، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤ : ل ١٤١ — ١٥٤.



بەم چەشنە تێروانینەیان بۆ شیعر لەبابەتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان دوورکەوتنەوە، رەنگە لە هەندێ دەقی شیعری رەمزیدا باس لە هەندێ رووداو یان لە هەندێ شوێن کرابێ بەڵام کات و شوێنی ئەو رووداوانە بێ پێناسە خراونەتە بەردەست و جێگاکانیش بێ دیاریکردن باسکراون بەو واتایەی کە ئەو ڕووداو و شوێنانە واقیعیانە مامەلە نەکراون بەڵکو ئەرکەکانیان ئەرکی جوانییە نەك مەبەستێك لەو دیویانا بوویێت. ئەم چەشنە مامەلە کردنە لەگەڵ شیعردا لای هەموو رابەرانی ئەم رێبازە بەدی دەکەین بەتایبەتی لای بودلێر و موریاس و مالارمیە و رامبۆ. [1]

## د - رێبازە ئەدەبییەکانی سەدەی بیستەم:

ئاشکرایە کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا چەند رێبازێکی تری ئەدەبی لەناو گەلانی ئەورووپادا سەریان هەڵدا کە ئەگەرچی لەبواری شیعردا تەمەنیان کورت بووە بەڵام کەم و زۆر کاریگەری خۆیان لەسەر ئەدەبی ئەورووپی و جیهانیش بەجێ هێشتووە، رێبازێك لەو رێبازانە ((رێبازی (دادا)یی بووە کە لەساڵی (١٩١٦) بانگەوازی بۆ کراوە)). [2]

بنەمای ئەم رێبازە لەو تێروانینەوە سەری هەڵدا کە هەروەك ((تریستیان تزارا)) دەڵێ: ((هیچ نرخ و بەهایەك بۆ مێژوو و رەوشت و نیشتمان و ئایین و خێزان و هونەر و ئازادی و برایەتی ناهێلێتەوە)) [3] هەربۆیە هیچ یەکێ لەو بەها و دیاردە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییانە لای دادابییەکان نەبۆتە بابەتێ کە باسکردنیان ئامانجێکی لەدواوە بێت نەك هەر ئەوەندە بەڵکو ((دژی عەقل و مەنتیق و نەریت و رەوشت کاریان دەکرد)) [4] بەم پێیە دەکرێ دادابییەکان وەك رێبازێ بەو شێوەیە بناسرێت کەنەك هەر لەبازنەی هونەر بۆ ژیاندا کاریان نەکردووە بەڵکو لەبازنەی هونەر بۆ هونەریشدا نەماونەتەوە چونکە: ((یاخی بوون لە هەموو بزووتنەوەیەکی هونەری و بەلایانەوە مرۆڤی دادایی دەبێت یاخی بێت لە هەموو شتێك تەنانەت لەخۆشی)) [5].

لەدوای رێبازی دادایی رێبازێکی تر سەری هەڵدا کە رێبازی سوریالی بوو.

١- مذاهب الادب الغربي، تأليف د. سالم احمد الحمداني : ص ٢٦٣

٢- الخلاصة في مذاهب الادب الغربي د. علي جواد الطاهر: ص ٧١.

٣- هـ. س : ص ٧٢ — ٧٣.

٤- المذاهب الادبية، د. جميل نصيف : ص ٣١٦ — ٣١٧.

٥- الخلاصة في مذاهب الادب العربي : ص ٧٤.

ئەم ڕێبازە بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە کە دەتوانین بەپێی دەرکردنی بەیانییەکەمیان لەساڵی (١٩٢٤) دا وە بەیانی دووەمیان لە ساڵی (١٩٢٩)دا ئەو قۆناغانە دیاری بکەین. لەبەیانییەکەمیاندا: ((سوریالییەکان باس لەو کۆت و پێوەندانە دەکەن کە لە ژیاندا مرۆڤیان پێ بەستراوەتەوە و بۆ ئەوەی ژیان بەئاسایی و سروشتی بڕوات بەڕێوە دەبێت ئەو کۆت و پێوەندانە بشکێندرێن)) [1] .

کەواتە لەناواخنی ئەم ڕێبازەدا هەست بەوە دەکرێ کە ئامانجیان (بەدی هێنانی ئەرکێکی مرۆڤانە بووە جا با بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆش بوویێت).[2]

لەدوای بەیانییەکەمیشیانەوە هەندێ لە سوریالییەکان زیاتر بایەخیان بەلایەنی ڕەوشتی داوە و هێمایان بۆ شۆڕشی کۆمەڵایەتی کردووە لەوانە ((بریتون)) یان دوای ئەوەی کتێبەکەی ((ترۆتسکی)) کە دەربارەی لینین بوو خوێندۆتەوە بانگەشەی بۆ حیزبی شیوعی کردووە و باسی لەشەیدا بوونی خۆی کردووە بە شۆڕشی ڕووسییەوە، هەر لێرە سوریالی بەشۆڕشگێڕییەتی ناسراوە و ئەو شۆڕشگێڕیەتیەش هەر لە سنووری نیشتمانیدا نەماوەتەوە و بەڵکو ڕووی لە چالاکی کۆمەڵایەتی کردووە و بەرەو ڕووخاندنی کۆمەڵگای سەرمایەداری ئاراستە کراوە.

لەدوای بەیانی دووەمی سوریالییەکانیشەوە هەر بریتۆن خۆی باس لەوە دەکات کە سوریالییەت هەوڵدەدا گرفتی ویژدان لە تێڕوانینی عەقلی و ڕەوشتی یەوە بوروژێنێ. نابێ ئەوەشمان لەیاد چێ کە ئەم چەشنە نزیک بوونەوەیەی سوریالییەکان لە بیر و باوەری شۆڕشگێڕی بەگشتی و لە تێڕوانینەکانی مارکس بەتایبەتی ڕێگر بووبێ لەبەردەم نزیک بوونەوە لە تێڕوانینەکانی فرۆید چونکە ڕێزیان لە کارەکانی فرۆید گرتووە و سوودیان لێ بینیوە.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەم نزیک بوونەوەیەی سوریالییەکان بەگشتی و بریتۆن بەتایبەتی لە بیری (مارکسی) تاسەر نەمایەوە بەڵکو لەساڵی (١٩٣٥)دا بریتۆن پەیوەندی بەحزبی شیوعییەوە نەما، ئەمەش تاڕادەیەك بوو بەهۆی ئەوەی کە هەندێ لە سوریالییەکان ئەو ئەرکە شۆڕشگێڕیەتییە لە شیعر دابماڵێنن کە پێشتر پێیان بەخشی بوو: ((تەنانەت هەر بریتۆن خۆی کاتێ بانگەشەی بۆ نووسینی ئۆتۆماتیکی کرد ئامانج و مەبەست و سوود وەرگرتنی لە شیعر دوورخستەوە)) .[3]

---

١- هـ. س : ص ٨١

٢- هـ. س : ص ٧٨.

٣- هـ. س : ص ١٠٧.



## ٢ – ئەرکی شیعر لە ئەدەبی عەرەبی دا

ئەگەر بمانەوێ باس لە شیعر و ئەرکی شیعر بکەین لە ئەدەبی عەرەبیدا، ئەوا دەبێ بۆ دەقەکانی سەردەمی جاهیلی بگەڕێینەوە، لەبەر ئەوەی شیعر شوێن و بایەخێکی تایبەتی خۆی هەبووە لەکۆمەڵگای عەرەبیدا.

دیارە کە شیعر لەسەردەمی جاهیلیدا تەنیا هۆکار بووە بۆ دەربڕینی دیاردەکانی ژیان، هەربۆیە وتراوە (الشعر دیوان العرب): ((شاعیر دەبوایە بەشیعرەکانی خزمەتی هۆزەکەی و باس لەکێشە و سەرکەوتنەکانی هۆزەکەی بکا و زمانحاڵ و نوێنەریان بێت لەکۆبوونەوە و ئاهەنگەکاندا))[1]

کەواتە شیعر لە سەردەمی جاهیلیدا ئامرازێك بووە بۆ دەربڕین لە باروودۆخی کۆمەڵگای عەرەبی، بۆیە هەر کاتێك: ((باس لە نەریت و ژیانی جاهیلییەکان بکرێ شیعرەکانیان بە بەڵگە و نموونە دەهێننەوە))[2]

لەڕێگەی قەسیدەوە کە دیارترین جۆری شیعری جاهیلی بوو، شاعیران بە وێنەگرتنی ئەو باروودۆخە کۆمەڵایەتییەی کە عەرەب تیایدا دەژیان جوانترین دەقی شیعرییان داهێناوە: ((شاعیری جاهیلی بە زمان و بانگەشەکەری سەرۆك و پاڵەوانەکانی هۆزەکەی خۆیان بۆ بەرگری کردن لێیان دادەنرێت)) [3] .

شاعیران بۆ ڕازاندنەوەی قەسیدەکانیان سەرەتا بە گریان لەسەر پاشماوە و شوێنەواری بەجێماو ئینجا بۆ وەسفی گەشتی بیابان و ئەسپ یان حوشتر ئینجا بەرەو وەسفی ئافرەت و زۆر وەستان لەسەر وەسفی خۆشەویستەکەیان دیارە کە ئەمەش بۆ مەبەستی چێژ وەرگرتن بووە، ئینجا چوونە ناو مەبەستی سەرەکی قەسیدەکە، جا مەبەستەکە هەر بابەتێك بێت لە (ستایش، داشۆرین، شانازی، لاوانەوە، شەرو شۆڕ و هاندان) [4] دەچوون.

---

١- الالتزام في الشعر العربي، الدكتور احمد ابو حاقة، الطبعة الاولى، دار العلم للملايين، بيروت : ص ٦٣ - ٦٤.

٢- تاريخ الادب العربي، العصر الجاهلي، الدكتور شوقي ضيف، الطبعة الثامنة، دار المعارف بمصر، ١٩٧٧ : ص ٢١٩.

٣- فصول في الشعر و نقده، د. شوقي الضيف، الطبعة الثامنة، دار المعارف، قاهرة، ١٩٧٧ : ص ١٣.

٤- بروانە العصر الجاهيلي، الدكتور شوقي ضيف : ل ٢١٤.

ئەم جۆرە دەست پێکردن و کۆتایی پێ هێنانە بەقەسیدە بووبوو بە نەریتێکی هونەری و هەموو شاعیرانی جاهیلی پێی پابەند بوون.

لەبابەتی (داشۆرین)دا شیعر ئەرکی بەرژەوەندی گشتی پێ بینراوە، وەك لەقەسیدەکانی (بشر بن ابی حازم الاسدی) دەبینرێ، کە باس لە: ((سەرکەوتنی هۆزەکەی بەسەر هۆزەکانی تر و هەجوی دوژمنەکان دەکات)) [1].

لەشیعری شەڕ و شۆڕ و (حەماسە)یشدا ئەرکی بەرگری و شانازی کردن بەهۆز و وەسف کردنی ئازایەتی پاڵەوانەکان و پیشاندانی چاونەترسی رۆڵەکانی هۆزەکەیان و هاندانیانی پێ بینراوە.

قەسیدەی لاوانەوەش جگە لەدەرخستنی خەمی دڵی شاعیر بۆ ئەو کەسە ئازیزەی کە مردووە و لێی دوور کەوتۆتەوە ئەرکی: ((وروژاندنی هۆزی بۆ تۆڵە سەندنەوەی خوێنی پاڵەوانەکان لەدوژمن و هاندانی رۆڵەکانیان بۆ چوونە شەڕ و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنان))[2]ی پێ بینراوە.

لە ستایش کردنا شیعر بۆ مەبەستی شانازی و پێداهەڵگوتن بەگەورە پیاوانی هۆز و خستنە رووی سیفاتی بەرزی هۆزەکەیان لە ((چاوتێری و ئازایەتی رۆڵەکانیان و رێز لێنان لە مێوان و پاراستنی مافی دراوسێ و... تاد)) [3] گوتراوە.

هەندێ جاریش ستایش ئامرازێك بووە بۆ سوود و بەرژەوەندی کەسی دیارە ئەمەش بەستایش کردنی: ((پیاوی دیار و میرەکانی مەناذرە و غەساسنە و هەروەها بۆ پڕوپاگەندە کردنی (دعایە) هۆزەکان لە نێوان خۆیاندا)). [4]

دیارە لەپاڵ ئەو ئەرکانەدا کە بەشیعر بینراوە دەتوانین بلێین شیعری جاهیلی بەهەڵبژاردنی جوانترین و بەهێزترین وشە و پەیرەوکردنییەکێتی کێش و سەروا و بەکارهێنانی هونەرەکانی رەوانبێژی و... داهێنانی زۆری تیاکراوە و ئەرکی جوانی پێ بینراوە. هەر بۆیە ئەم دەقانە لەسەردەمی خۆی و سەردەمەکانی دواتریش کاریگەری زۆری لەسەر شیعری شاعیرانی ئیسلامی بەگشتی و شیعری عەرەبی بەتایبەتی هەبووە و شاعیرانی عەرەب تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم

---

١- هـ. س : ص ٢٠١.

٢- هـ. س : ص ٢٠٧.

٣- هـ. س : ص ٢١٠.

٤- هـ. س : ص ٢١١.



نەیانتوانیوە خۆیان لەشوێن پێ هەڵگرتنی ئەو دەقانە رزگار بکەن. بۆیە ئەو قەسیدانەی سەردەمی جاهیلی بوونەتە هەوێنی سەدان قەسیدەی تری عەرەبی بۆ سەردەمەکانی دوای خۆی.

کاتێ کە ئایینی ئیسلام بڵاوبۆوە کۆمەڵگای عەرەبی سیما و گۆرانێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی و رەوشتی و ئەدەبی بەخۆوە بینی.

لە ئاکامی بەربەرەکانی و هێرش کردنی کافرەکان بۆ سەر ئایینی ئیسلام و پێغەمبەر و هاوەڵەکانی و بەراوردکردن و لێکچواندنی فەرموودەکانی پێغەمبەر و ئایەتەکان بەسیحر و شیعر، ئایینی ئیسلام هەڵوێستی خۆی بەچەند ئایەتێك دەربارەی شیعر و شاعیران دەربڕی: ((الشعراء یتبعهم الغاون، الم تر انهم في کل واد یهیمون، وانهم یقولون مالایفعلون، الا الذین امنوا وعملوا الصلحت وذکروا الله کثیراً، وانتصروا من بعد ما ظلموا وسیعلم الذین ظلموا أيَّ منقلب ینقلبون)). [1]

بەگوێرەی ئەم ئایەتانە شاعیران دەکران بەدوو بەش: شاعیری کافر و شاعیری ئیسلام، کەواتە دەقی شیعری کافر خراپە و دەقی شیعری ئیسلام باشە: ((هەستیار بەهۆی بڕوا و تێکۆشان و روون بیرییەوە دەتوانێ پلە و پایەیەکی بەرز لەکۆمەڵدا داگیر بکات و ئەو هەستیارەی کە بیر و باوەڕی نییە و هەموو رۆژێك لەسەر پەتێك یاری دەکات و کرداری لەگەڵ هەڵبەستەکانی ناگونجێن شایانی رێز و نرخ پێدان نییە)) [2]

کەواتە لە رووی هونەرییەوە ئەگەر دەقی شیعرەکە خراپیش بوایە چونکە بۆ مەبەستی ئایینی ئیسلام گوتراوە دەقی شیعرەکە لای ئیسلام باش بووە.

شیعری سەردەمی ئیسلام دەبوایە ئەرکی بانگەشەکردن بۆ ئایینی نوێ و باسی سەرکەوتنەکانی ئیسلام بەسەر کافر و هەروەها بایەخدان بەئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر و قەدەغەکردنی شیعری مەی و پێدا هەڵگوتن بەسەر ئافرەت دا ببینێ.

کەوابێ دەتوانین بلێین شیعر لەسەردەمی ئیسلامەتیدا ئەرکی چاکسازی و رەوشتی و کۆمەڵایەتی پێ بینراوە و لەبازنەیەکی سنووردارداا خولی خواردۆتەوە و شاعیر لە شیعرەکانیدا دەبوایە پابەند بێت بە داب و نەریتی کۆمەڵگاکەی و هونەر و ئەدەب دەبوایە: ((لەبەرژەوەندی

---

١- القرآن الکریم، سورة الشعراء، ئایەتی (٢٢٤ – ٢٢٧) : ل ٣٧٦.

٢- وێژەی کوردی و رەخنە سازی، پرۆفیسور کامل حەسەن عەزیز بەصیر، چ. الجاحظ، بەغدا، ١٩٩٠ : ل ١١٣.

کۆمەڵدا بێت و کاری هونەریش دوور بکرێتەوە لە خزمەتکردنی مەبەستەکانی تاك چونکە شاعیران پابەندبوون بە بەرژەوەندی کۆمەڵگا و بنەماکانی)) [1]

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە شیعر لە سەردەمی ئیسلامدا ئەرکی گۆڕانی ناوەڕۆکی پێ بینراوە، بەهۆی ئەمەشەوە لەڕووی هونەرییەوە بەرەو کزی و لاوازییەوە چووە: ((هەستیار بەرامبەر بەکاربەدەستان لە جێبەجێ کردنی پەیامی کۆمەڵدا بەرپرسیارە و بەگوێرەی رادەی هونەری و بەرزی ناوەڕۆکی هەڵبەستەکانی پاداشتی خۆی وەردەگرێ)) [2]

لەئاکامی ململانێی نێوان بنەماڵە و مەزهەبەکانیش لەسەردەمی (ئەمەوی)دا کۆمەڵگای ئیسلامی گۆڕانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فیکری و ئایینی بەسەردا هات و ژیان ئاڵۆزی بەخۆوە بینی.

لە ئاکامی سەرهەڵدانی چەند توێژێکی سیاسی ململانێ لەسەر دەسەڵات و کورسی خیلافە و بەڕێوەبردنی میللەت دروست بوو.

دیارە هەر توێژێك لەو توێژانە شاعیری تایبەت بەخۆی هەبووە و بۆیە لە ئاکامی ئەو ململانێیە شیعری سیاسی گەشەی سەند و شیعر ئەرکی مەزهەبی پێ دەبینرا: ((پیاهەڵدان بەسەر سەرکردەکانی بنەماڵەکان و باس لە بیر و بۆچوون و تێڕوانینی توێژەکان و هەروەها وەڵامدانەوە و روونکردنەوەی هەڵوێست و هەجوی ئەوانەی کە دژایەتییان لەگەڵدا دەکردن)) [3] بوون بەناوەڕۆکی دیاری شیعری ئەو سەردەمە.

هەر لەم سەردەمەدا و لەئاکامی بیرکردنەوەی نوێ و گۆڕانکارییەکان و لێکۆڵینەوە لە زمانی عەرەبی شیعر ئەرکی فێرکردنی پێ بینرا، بۆیە شاعیران :((لەزۆربەی شیعرەکانیان ئەرکی مامۆستا و پسپۆری زمانی عەرەبییان بۆ بەدیهێنانی ئامانج و فێرکردنی لاوان لەشارەزایی بوونیان لە زمانی عەرەبی پێ دەبینرا)) [4]

---

١- النقد الادبي عند العرب و اليونان معالمه واعلامه ، الدكتور. قصي الحسين، الطبعة الاولى، المؤسسة الحديثة للكتاب، طرابلس، لبنان، ٢٠٠٣ : ص ٧٠.

٢- وێژەی کوردی رەخنە سازی: ل ١١٣.

٣- بڕوانە الالتزام في الشعر العربي: ل ٧٢.

٤- التطور والتجديد في الشعر الاموي، تأليف، الدكتور شوقي ضيق، الطبعة الثالثة، دار المعارف بمصر، ١٩٦٥ : ل ٨٤.



لەسەردەمی عەباسییەکاندا کۆمەڵ گۆڕان و پێشکەوتنی لە هەموو بوارەکانی ژیان (زانستی و شارستانی و سیاسی و کۆمەڵایەتی) بەخۆوە بینی. ئەم پێشکەوتنەی ژیانی سەردەمی عەباسی لەئەدەب و هونەریش بەتایبەتی لە شیعردا رەنگی داوەتەوە.

لەو سەردەمەدا شیعری سیاسی لە ئاکامی ململانێ لەسەر حوکم و خیلافە و هەروەها ململانێ لەنێوان عەجەم و عەرەب دا سەری هەڵدا و بووە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە شاعیران روویان لە دەربڕینی سۆز و بیری نەتەوەیی کردووە وەك لەشیعرەکانی (الاصمعی، محمد بن یزید..)دا دەردەکەوێت، بەرامبەر ئەو چەشنە نەتەوە پەرستی یەی شاعیرانی عەرەب، کۆمەڵێ لە شاعیرانی گەلە موسڵمانەکان بەتایبەتی (فارسەکان) روویان لە دەربڕینی شانازی کردن بە نەتەوەکەیان کرد و ئەرکی دەربڕینی هەست و سۆزی نەتەوەیی یان بەشیعرەکانیان دەبینی، وەك لە شیعرەکانی (ابو العتاهیه، ابی نواس، بشار بن برد...) [1]دا دەردەکەوێت.

هەر لەو سەردەمەدا و لەسەردەستی کۆمەڵە شاعیرێك (ابو تمام، ابی نواس، بشار بن البرد، مسلم بن الولید...) کە دواتر ناویان بە (اصحاب البدیع) دەرکرد و ئەمانە توانییان شیعر بەرەو ئەرکی جوانکاری ببەن، بۆ ئەم مەبەستەش شیعرەکانیان بەهونەرەکانی رەوانبێژی دەڕازاندەوە و : ((بە وەرگرتنی بیر و باوەڕ و واتاکانی کۆن و خۆ خەریك کردن بەجوانکردنی شیعر و ئاڵۆزی لەدەستەواژەکان و واتاکانیش لەخزمەتی وشەکان دا بوون)). [2]

هەر لەپاڵ ئەم شاعیرانەدا کە بایەخیان بەلایەنی جوانکاری دەق دەدا، کۆمەڵێ شاعیری تریش هەوڵیان دا ئەرکی رەوشتی و ئایینی لەشیعر دابماڵێنن و قورئان بکەن بە سەرچاوەی بەدەست هێنانی جوانی دەربڕین، (ابو العتاهیه) لەم بارەیەوە دەڵێ : ((دوێنێ سورەتی (النبأ)م خوێندەوە، پاشان قەسیدەیەکی لەو جوانترم دانا)). [3]

دیارە ئەمانە بەم جۆرە تێڕوانینەیان بۆ شیعر خۆیان لە رێبازی هونەر بۆ هونەر نزیك کردۆتەوە، بەم پێیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا دەقی شیعر لەماوەی فەرمانڕەوایەتی

---

١- بڕوانە الالتزام فی الشعر العربی : ص ٨١ .

٢- البحتري بين نقاد عصره، صالح حسن اليظي، الطبعة الاولى، دار الاندلس، بيروت، لبنان، ١٩٨٢ : ص ٢٧ .

٣-لشعر العربي بين الجمود والتطور، تأليف الدكتور محمد عبدالعزيز الكفراوي، الطبعة الرابعة، دار النهضة بمصر (الفحالة)، القاهرة : ص ١٠٦.

عەباسییەکاندا ئەرکی جوانی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و پەروەردەیی و شارستانێتی رەنگ پێ داوەتەوە.

دوای عەباسییەکانیش بە داگیرکردنی بەغدا (٦٥٦ هـ – ١٢٥٨ ز) [1] لەلایەن مەغۆلەکانەوە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم ئەدەب و هونەریش رووی لە کزی و لاوازی کرد و هیچ گۆڕان و پێشکەوتنێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینی بۆیە ئەم ماوەیە بە (سەدە تاریکەکان) ناودەبرێت.

لەم قۆناغەدا لەبەر خراپی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و نائارامی شیعری (زهد و تەسەوف) گەشەی کرد و زیاتر تیایدا ئەرکی دوعا و پارانەوەی پێ دەبینرا. [2] ئەم لاوازییە لەبەرهەمی ئەدەبی عەرەبی تا کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لەبەردەوامی دابووە.

لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا بەکاریگەری و شارەزابوون و سوود وەرگرتن لە رۆشنبیری و ئەدەبیاتی نوێی ئەورووپا شاعیرانی عەرەب توانییان بەرهەمی ئەدەبی سەر لەنوێ ببوژێننەوە و گۆڕان و ئەرکی نوێشی پێ ببەخشن، دیارە گۆڕانکارییەکانیش بەچەند قۆناغێك تێ پەریوە، کە بریتی بوون لە قۆناغی لاسایی و بوژانەوە و قۆناغی نوێ بوونەوە..

لە قۆناغی لاسایی و بوژانەوەدا (محمود سامی البارودی، رصافی، الزهاوی و احمد شوقی و چەندانی تریش) لەشیعرەکانیاندا رێگایەکی نوێیان گرتبووە بەر بۆ گەڕانەوە بۆ شیعری سەردەمی جاهیلی و عەباسی بە وازهێنان لەزمانی شیعری کۆن بەتایبەتی لە هونەرەکانی رەوانبێژی و هەوەرها داوایان دەکرد شیعر ئەرکی: ((دەربڕین ببینێت بە تێکەڵ کردنی هەست و سۆزی خۆشەویستی ومرۆڤایەتی و دەرکەوتنی کەسایەتی شاعیر لە شیعرەکانیدا)) [3]. بەم داواکردنەش خۆیان لە رێبازی رۆمانتیکی ئەورووپی نزیك دەکردەوە.

لە قۆناغی نوێ بوونەوەشدا (خلیل مطران) کە پێشەوای ئەم قۆناغە بوو، چیرۆکی مێژوویی بەشیعر هێنایە ناو ئەدەبیاتی عەرەبی، و دوای دەرکردنی دیوانەکەی لەساڵی

١- بڕوانە تاريخ الادب العربي في مطلع القرن الخامس الهجري الى الفتح العثماني، تأليف د. عمرفروخ، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٨١ : ص ٦٠٢.

٢- في ادب العصور المتأخرة، الدكتور ناظم رشيد، طبع بمطابع جامعة الموصل، ١٩٨٥ : ص ٣٦.

٣- اضواء على الادب العربي المعاصر، تأليف انور الجندي، دار الكاتب العربي، القاهرة، ١٩٦٩ : ل ١٣٥ – ١٣٦ – ١٣٧.



(١٩٠٨) دا بانگەشەی بۆ: ((پەیڕەوکردنییەکێتی قەسیدە، لەگەل نوێ کردنەوەی ناوەڕۆك و سوود وەرگرتن لەرێباز و شیعری رۆژئاوایی...)) [1] دەکرد.

بە بۆچوونی (خلیل مطران) شیعر دەبێت وێنەی ژیانی سەردەمەکەی بکێشێ، دیارە ئەمەش بنەمایەکی سەرەکییە لە رێبازی واقیعی و هەنگاوێك بوو بۆ چوونە ناو ئەم رێبازە.

لەساڵی (١٩٠٩)دا سێ شاعیری میسری (عبدالرحمن شکری، ابراهیم عبدالقادرالمازنی و عباس محمود العقاد) قۆناغێك و بوژانەوەیەکی تریان لەئەدەبی عەرەبی کردەوە، ئەمانەش بەناوی (بزووتنەوەی دیوان) [2] ناوبانگیان دەرکرد.

ئەم قوتابخانەیە بەسوود وەرگرتن لەئەدەبیاتی ئینگلیزی دەیانویست شیعر بەرەو گۆڕان و نوێ بوونەوەی سەردەم ببەن و دەیانویست لە شیعردا بایەخ بە ئەرکی : ((هەست و سۆز بدرێ و یەکێتی قەسیدە بپارێزرێ و شیعر لەیەکێتی سەروا رزگار بکرێ بە بەکارهێنانی سەروای هەمە جۆر و رووکردنە سروشت و....)) [3]

دیارە کە ئەمانە لە شاعیرانی پێش خۆیان زیاتر لە سیما و تایبەتمەندییەکانی رۆمانتیکییەتی ئەورووپی نزیك دەبوونەوە.

هەر لە ساڵانی سەرەتای سەدەی رابوردوودا کە کۆمەڵگای عەرەبی لە بارێکی خراپ و دواکەوتوو لەبواری کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابووری و رۆشنبیری و شارستانێتی و نائارامی دەروونی دا دەژیان، نووسەر و شاعیران لە نێوان خۆیان دا وەك پێویستییەك بۆ چاکسازی ئەو بارودۆخە داوایان لێدەکرا کەلە بەرهەمی ئەدەبی و هونەری دا ئەرکی چاکسازی و خزمەتکردنی کۆمەڵگا ببینن، هەر بۆیە لەم ماوەیەدا رێبازی هونەر بۆکۆمەڵ سەری هەڵدا وە بەلایانەوە: ((شاعیر ئەو کەسەیە کە بە شیعرەکانی وێنەی ئێش و ئازاری خەڵکە گشتییەکە دەکێشێ و نەتەوە هەموو پێی کاریگەر دەبن و شیعرەکانی بەهۆش و ئازاری میللەت ئاو دەدا و دەینەخشێنێ)) [4].

١- هـ. س : ل ١٤٥.

٢- هـ. س : ل ١٤٨

٣- هـ. س : ل ١٥١.

٤- نقد الشعر العربي الحديث في العراق من ١٩٢٠ – ١٩٥٨، عباس توفيق، دار الرسالة للطباعة، ١٩٧٨ : ص ١٥٨ .

بەم پێیە ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەتی ئەرکی خستنەڕووی هیواو ئاواتی میللەت و خزمەتکردنی کۆمەڵگای پێ دەبینرا: ((دۆزینەوە و دەرخستنی خراپەکانی کۆمەڵ و نوێنەرایەتی ئێش و ئازار و هیواکانی میللەت لەهەست کردن بە واقیعەکەی و تێروانینی بۆ واقیعێکی باشتر و تەواوتر ئنجا وەسف کردنێکی رووتی واقیع بۆ زانینی کەم و کوڕییەکان و هاندانی جەماوە بۆ چاك کردنیان))[1].

دیارە هەر لەپاڵ ئەو بانگەشەکردنانەدا بۆ ئەدەبێکی پەیامدار هەندێ لە نووسەران بایەخیان بەرێبازی (هونەر بۆ هونەر) دەدا و بەلایانەوە: ((شیعر کۆمەڵە وێنە و بیر و بۆچوونێکە شاعیر لەوشەدا رێکی دەخات کە هیچ سوودێکی تایبەتی لە پشتەوە نییە بەڵکو ئامانجی بەخشینی چێژ و خۆشییە بۆ دەروونی وەرگر، ئەمانە داوای دوورخستنەوەی شیعریان لەمەبەستی سوود گەیاندن بەلایەنی رەوشتی و کۆمەڵایەتی دەکرد))[2].

لەگەڵ ئەم بۆچوونەشدا شیعری عەرەبی لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هەر لەبازنەی رێبازی (هونەر بۆ کۆمەڵ) دا مایەوە و پەیامداری بۆ خۆی دیارترین سیمای شیعری ئەو قۆناغەی ئەدەبی عەرەبی بووە.

---

١- هـ. س : ص ١٦٣

٢- هـ. س : ص ١٨٩.



### ٣- ئەرکی شیعر لە ئەدەبی فارسی دا:

ئاشکرایە کە ئەدەبی فارسی میژوویەکی کۆنی هەیە و لەپێش سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام شیعری فارسی ئەرکەکانی لەرێگەی سروودەکانی وەك سروودی (خوسرەوانی) کەلە کۆڕ و یادە ئایینییەکان و هەروەها داستانەکاندا کەباسی حەماسە و بەسەرداهەڵگوتن بەسەر پیاو چاکان و پاشاکانی تیا دەخرایەڕوو، دەبینیٚ[1].

ئەمانە هەرچەندە کەبە شێویەکی سادە دەربڕاون و بەسەرزاری ماونەتەوە و بەڵام بەنووسراوی لەبەردەستدا نین. بۆ کۆنترین دەقی شیعری کەلەبەر دەستدا بێت چیرۆکە شیعرێکە کەبەناوی (درخت اسوريك)ە[2] بریتییە لە گفتوگۆ لەنێوان (بزن و دارخورما) دیارە ناوەرۆکەکەشی ئەرکی خستنەڕووی سوودەکانی بزن و دارخورمای پێ بینراوە.

ئەم چیرۆکەش بەشێوەو زمانێکی شیعری ساکار نووسراوە و ناوەڕۆکێکی لاوازی هەیە. بەو پێیە دەگەینە ئەو راستییەی کەوا شیعری فارسی پێش سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام زیاتر ئەرکی ئامۆژگاری پێ بینراوە.

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلام لەناو گەلانی ئێران دا رۆشنبیر و شاعیران کەوتوونەتە ژێر کاریگەری زمانی عەرەبی و سوودێکی زۆریان لە زمان و ئەدەبی عەرەبی وەرگرتووە.

تەنانەت هەندێ لەشاعیرانی ئەو سەردەمی کە بەڕەگەز فارس بوون (((بشار بن برد وابی نواس) بەزمانی عەرەبی و هەندێکی تریش بەهەردوو زمانەکە شیعریان دەنووسی))[3]. هەر لەسەر دەستی ئەو شاعیرانە بوو کە شیعری عەرەبی بەرەو ئەرکی جوانکاری برا.

شیعری فارسی بەکاریگەری و لاسایی کردنەوەی قەسیدەی عەرەبی لەشێوەی دەست پێ کردن و چوونە ناو بابەتی مەبەستی قەسیدە و کۆتایی پێ هێنانی بە بابەتی ستایش ئەرکی جوانکاری پێ بینراوە، وەك : ((لەقەسیدەیەکی (عباس المروی) دا دەردەکەوێت کە ستایشی خەلیفە (المأمون) دەکات))[4].

---

١- سبك شناسى زبان و شعر فارسى، نوشته : محمد تقى بهار، چ. رامين، تهران، انتشارات مجيد ١٩٧٧، ص١٧٠.

٢- بڕوانە دراسات في الشعر الفارسي حتى قرن الخامس الهجري ، د. محمد نورالدين عبدالمنعم، مطبعة دار الثقافة، قاهرة، ١٩٧٦ : ص ٨ — ٩.

٣- تأريخ الادب الفارسي، د. رضا زادة شفق ترجمة محمد موسى هنداوى، الناشر، دار الفكر العربي، ١٩٤٧ : ص ١٦.

٤- هـ. س: ل ٢١.

هەر لەپاڵ ئەم ئەرکەدا کۆمەڵە ئەرکی تری وەك شانازی کردن بە نەتەوە سەری هەڵدا و لەئاکامدا دیاردە و ململانێی گەلپەروەری (الشعوبیە) سەری هەڵدا. [*]

لەو سەردەمەدا شیعر بەئەرکی ئایینی و گلەیی و رەخنەی کۆمەڵایەتی و رەوشتی و نارەزایی لە شێوازی دەسەڵات هەستاوە، تەنانەت لەسەر ئەم رەخنە و نارەزایانە هەندێ لەشاعیرانی وەك (فیردەوسی، مەسعود سەعد سەلمان، مەسعود رازی، تووشی زیندانی کردن هاتوون) [1].

شیعری داشۆرین ئەرکی رەخنەگرتنی لە رەوشت و دەسەڵات و بارودۆخی سەردەمەکە بینیوە، وەك لە شیعرەکانی: (ناصر خەسرەو، مەسعود سەعد سلمان، سەنائی غەزنەوی.. هتد) [2] دەردەکەوێت.

لە غەزەل دا شیعر ئەرکی جوانکاری بینیوە و بابەتی شیعری وەکو ((عیشق و گلەیی لەدەست بارودۆخ و هەندێ جاریش مەسەلەی فەلسەفی و تەسەوف)) [3] تیادا دەخرایەڕوو.

هەر بەهاندانی کاربەدەست و پاشاکان داستانی نەتەوەیی و حەماسی سەری هەڵدا وەك داستانی (شانامە) کە لە نووسینی (فیردەوسی)یە، ئەم داستانە بابەتی: ((مێژوویی و چیرۆکی سۆزداری و زانیاری کۆمەڵایەتی پێش هاتنی ئایینی ئیسلام و باسی ئایینی زەردەشت و بابەتی فۆلکلۆری)) [4] دەگرێتە خۆی.

هەروەها داستانەکە ئەرکی ستایش کردنی پێغەمبەر و هاوەڵەکانی و پاشاکان و لاوانەوە و گلەیی و ئامۆژگاری خستنەڕووی بابەتی شەڕ و پاڵەوانێتی و ناوهێنانی چیرۆکی شایەکانی کۆنی بینیوە [5].

---

(*) لە ئەرکی شیعر لە ئەدەبی عەرەبی ئاماژە بەو باسە کراوە.

١- سبك شناسى زبان و شعر فارسى، نوشته محمد تقى بهار : ص ٢٧ .

٢- هـ. س: ل ٢٨.

٣- هـ. س: ل ١٦١ - ١٦٣.

٤- من روائع الادب الفارسي تأليف الدكتور بديع محمد جمعة، الطبعة الاولى، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧٨: ص ١٨٩ — ١٩٠.

٥- جولة في شاهنامة الفردوسي، الدكتور امين عبدالمجيد البدوي، مطبعة السعادة، قاهرة، ١٩٧٦ : ص ٢٠— ٢١ .



هەر بۆیە زۆر لە لێکۆڵەرەوان تەنها بۆ لایەنی جوانی و هونەری ناڕواننە داستانەکە بەڵکو وەکو سەرچاوەیەکی مێژووییش بایەخی پێ دەدەن.

هەرلەو سەردەمەدا چەند شاعیرێك وەکو زانا و فەیلەسوف بەدەرکەوتن لەوانە (خەیام) بوو، کەبەچوارینەکانی ئەرکی نارەزایی و گلەیی بەرامبەر بەکۆمەڵ و ئایین و داب و نەریت تێکەڵ بەبابەتی فەلسەفی دەخستەڕوو، بۆیە دەڵێن چوارینەکانی خەیام : ((بەشۆڕشێك لەسەر ئایین و پیاوە خراپەکانی ئایین و هەروەها لەسەر عەقل و ئاسمان و گەردوون و رۆژگار)) [1] دادەنرێت.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا و لەئاکامی تێکەڵاو بوونێکی تر لەگەڵ ئەورووپا و شارەزابوون لە ئەدەبی نوێی ئەورووپا و سوود وەرگرتن لێ یان، ئەدەب و هونەری فارسیش توانی بەرەو نوێ بوونەوەی خۆی بچێت بەتایبەتی لە شیعرا چ لە رووخسار چ لە ناوەڕۆك توانی بەرگێکی نوێ بەسەر خۆیدا بهێنێت.

بۆیە شیعر لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا ئەرکی دەربڕینی ئێش و ئازاری چینەکانی کۆمەڵی لە ئەستۆی خۆی گرت و شیعر بەشۆڕشێکی گشتی کۆمەڵایەتی پابەندبوو: ((لە مێژووی ئەدەبی فارسیدا لەسەردەمی (مشروتیەت)دا ئەدەب بۆ یەکەم جار بە چەمکی گشتی خۆیەوە دێتە نێو جەماوەر و خەڵکێکی زۆر لەڕێگای رۆژنامەوە لەگەڵ ئەدەبی شۆڕشگێڕانەی سەردەمی خۆیدا پەیوەندییەکی بەردەوام پەیدا دەکات)) [2].

هەر لەئاکامی گەندەڵی سیاسی و زۆرداری دەسەڵاتدارانی ئێرانی بەرامبەر بە میللەت، میللەت بەگشتی و چینی رۆشنبیر و رەنجدەران بەتایبەتی داوای دانانی دەستوورێکیان دەکرد کە میللەت بەشداری دەسەڵاتی میری بکات لە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات. شاعیران لەم ماوەیەدا بەشیعرەکانیان هێرشیان دەبردە سەر ئەوانەی کە دژی دانانی دەستوور بوون، وەك لەشیعرێکی (اشرف الجیلانی) [3] دا دەردەکەوێت.

لەسەردەمی مەشروتییەدا گۆڕانێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی بەسەر وڵاتدا هات و باسی ئازادی و نیشتمانی لەئارادا بوو دیارە ئەم بارودۆخەش لەشیعری سەردەمەکە رەنگی داوەتەوە: ((لەسالآنی مەشروتەدا شیعر بۆ خۆی رۆلێکی گەورەی بینی لەهاندان و وریاکردنەوە و جۆش

---

١- ثورة الخيام، عبدالحق فاضل، البطعة الثانية، دار العلم للملايين ن بيروت، ١٩٦٨: ل ٣٩٤ — ٣٩٥.

٢- سبك شناسى شعر سيروس شميسا، چاپ هفتم انتشارات فردوس، چاپخانه رامين، تهران، ١٣٨٠: ل ٣٤٠.

٣- برِوانة من قضايا الشعرالفارسي الحديث، الدكتور بديع محمد: ص ٧٩ — ٨٠.

دانی کۆمەڵانی خەڵك دا بەڕادەیەك کە دەتوانین بڵێین شیعری ئەو ساڵانە راستەوخۆ سیمای جەماوەریان پۆشیبوو لەبازنەی دەستەی هەڵبژاردە و دەربارەوە هاتە دەرەوە و چووە ناو کۆمەڵانی خەڵکەوە)).[1]

هەر لەو سەردەمەدا و گەلێ لە شاعیران ئەرکی هاندان و وشیار کردنەوەی شاعیرانی تریان بینیوە بۆ ئەوەی بەشیعرەکانیان خزمەتی ولآت بکەن و پشت لەباس و خواستی دلبەر بکەن، وەك لە شیعرێکی (ادیب الممالك)دا دەبینرێ کە دەڵێ:

تاکی ای شاعر سخن پرداز     میکنی وصفی دلبران طراز
هوس عشقبازی اردارى     باوطن هم قمارعشق بباز
از وطن نیست دلبری بهتر     باوطن دل بده زروی نیاز
در اصول ترقیات وطن     شعر برگو گزیده و ممتاز [2]

دیارە شیعری فارسی لەم قۆناغەدا تەنها رەنگ رێژی بارە کۆمەڵایەتییەکەی قۆناغەکە نەبووە بەڵکو چەند ئەرکێکی تری وەك ((وەسفی، مێژوویی، نیشتمانی، سیاسی، ئەخلاقی، پەروەردەیی، پیشەسازی...)) [3] لەئەستۆ گرتووە.

شیعری نوێ و سەرنج دان بەمەسەلەی مرۆڤی ئەمرۆ گۆڕانکارییەکی گەورەی لەهەرێمی شیعر هێنایە ئاراوە و شەپۆلی نوێی لە رووخسار داهێنا، وەك لە شیعری ئازاددا دەردەکەوێت.

کەواتە لێرەوە دەتوانین بلێین کە شاعیرانی فارس لەسەرەتای سەدەی رابووردوودا شیعرەکانیان لەخزمەت خۆشەویستی و پیرۆزی خاکەکەیان داناوە و خەباتی شاعیران شان بەشانی خەباتگێر و شۆڕشگێڕەکانی ولآت لەبەردەوامی دابووە

١- نامەی ماستەر، شەقلی نوێخوازی لەشیعری کوردی و فارس سەدەی بیستەمدا (١٩٠٠ — ١٩٧٥)، محەمەد ئەمین محەمەد نوری ئەمین، کۆلیجی زمان زانکۆی سلیمانی: ل ٨ — ٩.

٢- دیوانی کامل ادیب الممالك، فراهانی قائم مقام، تصحیح حواشی و اهتمام استاد سخن وحید دستکردی، چاپخانه مروی، ١٣٥٤ : ل ٢٨٥.

٣- نامەی ماستەر، شەقلی نوێخوازی لەشیعری کوردی و فارسی (١٩٠٠ — ١٩٧٥)، محەمەد ئەمین محەمەد: ل ٤٥.



لە بیستەکانی سەدەی بیستەمیشدا شاعیرانی فارس هەستیان بەدواکەوتوویی باری کۆمەڵایەتی میللەت کردووە بۆیە لە شیعرەکانیان ئەرکی کۆمەڵایەتییان بەخستنەڕووی هۆکاری ئەو دواکەوتنە کە خۆی لەنەزانین و نەخوێندەواری و بەرتیل وەرگرتن و بێکاری دا دەبینییەوە، هەروەها ئەرکی ئامۆژگاری کۆمەڵ بەپیشاندانی رێگای دروست بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشییەکانی کۆمەڵ و رزگاربوون لێیان بۆ پێش خستنی ولآت، بینیوە.[1]

لە لایەکی ترەوە ئاشکرایە کە ئافرەتی فارسیش لەو سەردەمەدا وەکو هەر ئافرەتێکی تری رۆژهەڵاتی ئیسلامی بێ بەش بووە لەهەموو مافەکانی و لەبەشداری کردنی چالآکییەکانی ژیان لە کۆمەڵگاکەی وەکو ئادەمیزادێك، بەڵام لەگەڵ گۆڕانکاری و پێشکەوتنی ژیان لەوولآتان و نوێ بوونەوەی شارستانییەت و کۆمەڵگای ئێران، ئافرەتی ئێرانیش توانی هەندێك لەمافەکانی خۆی بەدەست بهێنێ و ببێتە ئەندامێکی چالاکی کۆمەڵگاکەی و هەروەها توانی رۆڵی خۆی لەمەیدانی ئەدەب و هونەریش ببینێ.

بۆیە چەند ئافرەتێکی بە توانا وەکو شاعیر دەرکەوتن و توانییان ئەرکی خۆیان بەرامبەر بە ژیان و کێشەکانی کۆمەڵگا لە شیعرەکانیاندا رەنگ پێ بدەنەوە، لەوانە ((بدری تندری) کەلە شیعرێکیدا بەناوی (سەربەستی ئافرەت) گلەیی لەو بارودۆخە دەکات کە ئافرەتی تیادا چەوسێنراوەتەوە، هەروەها (توران بهرامی)یش لەشیعرێکی دا بەناوی (ئەی ئافرەت) داوای رزگار کردنی ئافرەتی دەکرد).[2]

لەئاکامی وێرانکاری جەنگی دووەمی جیهانی و دژایەتی و خراپەکاری ئیمپریالیزم بەرامبەر بەگەلانی ژێر دەست و چەوساندنەوەیان: ((دیاردەیەکی هەرە دیاری ئەم قۆناغە لەڕووی سیاسی و ئەدەبییەوە سەرهەڵدانی بزووتنەوەی ئاشتی خوازی بوو، ئەوە بوو لەو ساڵانەدا کۆمەڵەیەك بەناوی (کۆمەڵەی ئاشتی خوازان) پێك هێنرا لەپێناو بەدی هێنانی ئاشتی جیهانیدا خەباتیان دەکرد و دژی جەنگ راوەستابوون، دیارە هەرلەژێر کاریگەری ئەم بزوتنەوەیەشدا رێرەوی شیعری ئاشتی خوازی جێگەی خۆی لەناو ئەدەبی فارس ئەو سەردەمەدا کردەوە)).[3]

١- من قضايا الشعر الفارسي الحديث، الدكتور بديع محمد جمعة : ص ٢٣ — ٢٤.

٢- من روائع الادب الفارسي، تاليف الدكتور بديع محمد جمعة : ص ٣٤٦ — ٣٤٧.

٣- نامەی ماستەر، شەقلی نوێخوازی لەشیعری کوردی و فارسی سەدەی بیستەمدا (١٩٠٠ — ١٩٧٥) : ل ٥٨ .

## ٤ – ئەرکی شیعر لە ئەدەبی تورکی دا:

وەك ئاشكرایە لەسەرەتای سەدەی رابووردوودا شیعری کوردی راستەوخۆ رووی لەئەدەبی تورکیش کردووە و بۆ کۆمەڵێ شاعیری نوێخواز بووەتە سەرچاوەی داهێنان هەر بۆیە بەپێویست دەزانین کە ئاورێك لە ئەرکی شیعریش لەو ئەدەبەدا بدەینەوە.

شیعری تورکی پێش سەرهەڵدانی ئایینی ئیسلام ئەرکی دەربڕین و رەنگدانەوەی بار و ژیانی میللەتی تورکی بینیوە ئەمەش لەرێگەی بابەتی لاوانەوە و داستانە نەتەوەییەکانەوە کە بەچوارینە و لەسەر کێشی پەنجە نووسراون ((داستانی (ایفور) کە بەشێکی بەناوی (اوغوز نامە)یە باس لە جەنگەکان و پاڵەوانێتی یەکێك لە پاشا تورکەکان کە ناوی (اوغوز خان) بوو، دەکات)).[1]

دوای هاتنی ئایینی ئیسلام و بە ئیسلام بوونی میللەتی تورك شیعری تورکی بووەتە دوو بەش : أ- شیعری میللی (شعبی) ، ب – شیعری دیوان.

### أ- شیعری میللی:

شیعری میللی هۆکارێك بووە بۆ پاراستنی کەلەپوور و زمانی تورکی، ئەرکی دەربڕینی هەستی ئایینی و کێشە و گیروگرفتی ژیانی رۆژانەی میللەتی تورکی بینیوە و: ((کەلەپورێکی نەمرەو هەموو لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی و داب و نەریت و بابەتی داڵداری و مردن و ئازایەتی و ئایین وکێشە و رووداوی رۆژانەی تاك وکۆمەڵی تورکی گرتۆتە خۆی))[2]

هەر لە شیعری میللی تورکی دا ئەرکی چەسپاندن و پتەو کردنی ئایینی ئیسلامی بینراوە و بۆتە هۆکارێك بۆ ئەم مەبەستە ئەمەش لە شیعری تەسەوف دا دەردەکەوێت کاتێك کەلە سەردەستی (احمد یسوی) سەری هەڵدا و لە دیوانێکدا بەناوی (دیوان حکمت) شیعرەکانی بڵاو کردەوە کە تیایدا ئەرکی ((ستایش کردنی پێغەمبەر (د.خ) و رووداوەکانی ژیان و باسی مردن و رەوشتی))[3] پێ بینیوە.

١- قصائد مختارة من الشعر التركي امعاصر، ترجمة، عبداللطيف بندر اوغلو، دار الشؤون الثقافية العامة، الطبعة الثانية، بغداد، ١٩٨٦ : ص ١٥.

٢- اشارات اولية في الشعر التركي، تأليف عبداللطيف بندر اوغلو، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣: ص ١٧.

٣- هـ. س : ص ٢١ – ٢٢.



هەروەها شیعر لەلای (یونس امره)ش بۆتە ئامرازێك بۆ خستنەرووی بابەتی: ((فەلسەفە و بۆچوونە مرۆڤایەتی و بەیەك چاو سەیرکردنی خەلك بێ ئەوەی نەتەوە و نەژاد و ئایین لەبەرچاو بگیرێت و هەروەها بۆ خستنەرووی ئامۆژگاری و ئیش و ئازار و برسێتی و هەژاری لادێییەکان بەشێوازێکی سۆفیانە))[1]، وەك لە شیعرێکی دا بەناوی (اسیر محترقاً)دا دەبینرێ کە بەرۆحێکی سۆفییانە باس لە عەشق دەکات.

لەپاڵ ئەوانەدا شیعری میللی تورکی هەندێك جار دوور لەباسی ئایین ئەرکی دەربڕینی هەست و سۆزی دڵداری و خستنەرووی سیفەتی چاوتێری و ئازایەتی و خۆبەخت کردنی بینیوە، وەك لەشیعرێکی (کور اوغلو)دا دەردەکەوێ کە تیایدا باس لە سەفەر و پاڵەوانێتی و خۆبەخت کردن و شانازی و چاونەترسی دەکات * .

### ب – شیعری دیوان:

شیعری دیوان لەسەر دەستی شاعیرانی وەك: عاشق پاشا، کولشهری، نسیمی البغدادی، فضولی البغدادی و چەندانی تر سەری هەڵداوە و بابەتی جیاجیای لەخۆوە گرتووە وەك باسی: ((خواردنەوە و راوکردن و ستایش کردنی پاشاکان و وەسف کردنی گەشت و گوزار و راوکردنی میرو پاشاکان))[2].

هەر لەلای (فضولی البغدادی) شیعر ئەرکی رەخنەگرتنی پێ لە ((بارودۆخی کۆمەڵایەتی لەسەردەمی خۆی بەتێڕوانینێکی مرۆڤانە و وشیارانە))[3] بینراوە.

هەرلەو سەردەمەدا شێوازی چیرۆکە شیعر لە شیعری تورکی سەری هەڵدا کە دەربارەی: ((ژیانی پێغەمبەر (د.خ) و شەهید بوونی حسێن))[4] بوو.

لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا و لە ئاکامی توندڕەوی و خراپەکاری بنەماڵەی عوسمانییەکان لەگەڵ میللەتی تورك، شیعر ئەرکی دەربڕینی ئیش و ئازاری میللەت و گلەیی و

١- هـ. س: ص ٢٣.

(*) هـ. س: ص ٣٣.

٢- قصائد مختارة من الشعر التركي المعاصر، ترجمة عبداللطيف بندر اوغلو : ص ٢١.

٣- هـ. س: ص ٢٢.

٤- هـ. س: ص ٢٢.

خستنەڕووی خراپەکاری و هێرش بردنە سەر سیستەمی کۆمەڵایەتی بینیوە: ((شیعری کۆمەلایەتی لە ئاکامی فەرامۆشکردنی میللەت لە لایەن پاشاکان کە تەنها ئاگایان لەخۆشی و ژیانی خۆیان و خەریکی دابەشکردنی خێر و بێری ولات لەنێوان خزم و کەسانیاندا بوون)) [1]

لەسەدەی نۆزدەهەمدا شیعری تورکی بەکاریگەری و سوود وەرگرتن لە ئەدەبیاتی ئەورووپی شاعیرانی وەك (ضیاء پاشا، عبدالحق حامد، نامق کمال و شناسی) شۆڕشێکیان بەسەر ئەدەبی کۆنی تورکی بەگشتی و شیعر بەتایبەتی داهێنا.

ئەرکی شیعر لەلای ئەم نەوە نوێیە بریتی بوو لە: ((بەستنەوە لە نێوان ئەدەب و سیاسەت لەلایەك وە لە نێوان ئەدەب و میللەت لەلایەکی تر)) [2]

هەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە بەکاریگەری ئەدەبیاتی ئەورووپی و ڕۆژئاوایی بزووتنەوەیەکی شیعری بەناوی (شعر التنظیمات) سەری هەڵدا کە وەکو: ((بەرپەرچ دانەوەیەك بوو بەرامبەر بە شیعری دیوان و بایەخدان بەناوەڕۆکی قەسیدە زیاتر لە شێوەی قەسیدە)) [3]

شیعری تەنزیمات ئەرکی دەربڕینی ((هەست و سۆزی رومانسیانەی تێکەل بەخەیالی ڕۆژهەڵاتی و رۆحی نەتەوەیی)) [4] بینیوە، هەروەها ئامانجی ئەوە بوو کە: ((ئەدەب و هونەر لە خزمەت ژیان و نیشتمان بێت هەروەها بەتیروانینێکی گەشبین و خەباتگێرانە بەمەبەستی گەیشتن بەهیوا و ئاواتەکان سەیری جیهانیان دەکرد)). [5]

لەکۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستەم کۆمەلە شاعیر و نووسەرێکی تورك (رجائی زادە اکرم، توفیق فکرت، جناب شهاب الدین، جلال ساهر و چەندانی تریش) بەکاریگەری و سوود وەرگرتن لەئەدەبیاتی ڕۆژئاوایی و ڕێبازی واقیعی و ڕەمزی و رومانتیکی فەرەنسی لەرێگەی دەرکردنی گۆڤارێکی هەفتانە لەئەستەمبول بەناوی (ثروتی فنون) بەتێڕوانینێکی نوێ بزووتنەوەیەکی نوێیان لە فیکر و ئەدەبیاتی تورکیدا داهێنا.

---

١- هـ. س: ص ٢٣.

٢- هـ. س: ص ٢٣.

٣- بڕوانە اشارات اولیە في الشعر الترکی، تألیف عبداللگیف بندر اوغلو : ص ٤٣ — ٤٤.

٤- هـ. س: ص ٤٤.

٥- هـ. س: ص ٤٤ — ٤٥.



لەم گۆڤارەدا شیعر ((رووی لەکێشە کۆمەڵایەتییەکان و بابەتی مردن و خەم و گریان و هەست کردن بەزوڵم و زۆرداری و چەوساندنەوەی سیستەم)) [1] کردووە.

شیعر لای (توفیق فیکرت) رووی لە ((دەمارگرژی و بەرپەرچدانەوەی دەمارگیریی ئایینی و مێژووی کۆن)) [2] کردبوو، لەشیعرێکی دا بەناوی سبەی: باس لەگۆڕانکاری و هیوا خوازی ڕۆژێکی پرشنگدار و گەشبین بۆ داهاتووی لاوەکان وهەروەها باس لەخۆشەویستی ولات دەکات.[※]

لەدوای داخستنی گۆڤاری (ثروتی فنون)یش لەلایەن دەسەلاتدارانی حکوومەتی تورکیا و هەر لەژێر کاریگەری ئەم گۆڤارە کۆمەلێك نووسەر و شاعیری نەوەی نوێی تورك کەناویان لە خۆیان نا (فجری آتی) دەرکەوتن و ئامانج و ئەرکی شیعر لەلای ئەم نەوەیە رووی کردە: ((گەشە پێدان بەزمان و ئەدەب و زانستە کۆمەلایەتییەکان و کردنەوەی هەل لەپێش گەنجە بەهرەدارەکاندا بۆ گەشەپێدان بەتواناکانیان)) [3]

لەچاریەکی یەکەمی سەدەی بیستەم کۆمەلە شاعیرێکی لاو (محمد عاکف، یحیی کمال بیاتلی، ضیا گوك الب..) هاتنە ئاراوە و ئەرکی شیعر لەلایان خۆی لەدەربڕینی بابەتی ((نەتەوەیی و رومانتیکی و ئایینی ئیسلامی و زمان و رەوشت و باسی ولات و وەزیفە)) [4] دەبینییەوە.

(ناظم حکمت)یش کە بەپێشرەوی شیعری ئازاد و نوێکەرەوەی ئەدەبیاتی تورکی دادەنرێت لە شیعرەکانیدا ئەرکی دەربڕینی گیروگرفتی راستەقینەی میللەت و پیشاندانی برسێتی میللەتی تورك دەبینێ.

لەدوای بانگەوازکردنی کۆماری لە (١٩٢٣) شیعری نوێی تورکی لەلایەن هەندێك شاعیر ئەرکی ستایش و پیاهەڵدان بەشیعرەکانیان بەسەر (کەمال ئاتاتورك) و سیستەم و دام و دەزگای میری یەکەی دەبینێ.

---

١- هـ. س: ص ٤٦ — ٤٧.

( (6توفیق فیکرەت و شاعیرە نوێخوازەکانی کورد — ئەحمەد تاقانە: ل ١١.

(※) هـ. س: ل٣٧- ٣٨ — ٣٩

٢- اشارات اولیة في الشعر الترکي، تألیف عبداللطیف بندر اوغلو: ص ٥٠.

٣- هـ. س : ص ٥٢.

هەر لـەم ماوەیـەدا (نـاظم حکمـت) ئـەرکی مژدەهێنـەری (شـۆڕش و بـاوەڕی بەپێویـستی بوونییەکسانی کۆمەلایەتی و برایەتی و مرۆڤایەتی)) [1] دەبینێ.

لەساڵی (١٩٣٣) ململانێ لەنێوان کۆن و نوێ پەیدا دەبـێ و ڕێبـازی شـیعری ((شـیعر بـۆ میللەت و شیعر بۆ شیعر)) [2] سەرهەڵدەدا لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا ئەرکی شیعر گـۆڕانی بەسەردا دێت و شیعری کۆمەلایـەتی سـەرهەڵدەدا و شـیعر ئـەرکی دەربڕینـی ژیـان و کێـشەی جووتیار و لادێیی تورکی دەبینێ لەو شاعیرانە (احمد عـارف، مـتین ال اوغلـو، نجـاتی جمعـەلی، بکر صدقی اردوغان...) [3]

لەساڵی ١٩٤١ سێ شاعیری تـورکی (اورخـان ولـی قـانیق، اوقتـای رفعت، ملـیح جـودت اندلی) کۆمەڵە شیعرێکی هاوبەشیان بەناوی (الغریـب) بڵاوکـردەوە. ئەمانـە بـە شـیعرەکانیان توانییـان ئـەرکی دەربڕینـی: ((پەیوەنـدی نێـوان مـرۆڤ و جـوانی ژیـان و نزیـك بوونـەوە لـە گیروگرفتەکانی خەلك و لە ریالیزمی ئیشتراکی و ململانێی چینایەتی و نزیك بوونەوە لە کێشە و ئازارەکانی میللەت)) [4] ڕەنگ پێ بدەنەوە.

هەروەك لە قەسیدەیەکی (اوقتلی رفعت) کە بەناوی (ئازادیش دەستدارە)[*] دا دەردەکـەوێت کە بەتێڕوانینێکی گەشـبینانە بـۆ دوارۆژ بـاس و بابـەتی سەربەسـتی و کرێکـار و ئـیش کـردن دەخاتەڕوو.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەرکی شیعر لەساڵانی (١٩٤٠ — ١٩٥٠)دا زیاتر خـۆی لـە بابەتی واقیعی و کێشەی سەردەم و دەربڕینی کێشەی کۆمەلایەتی و سیاسـی میللـەتی تـورکی بینیوە.

بەم ڕەنگە دەبیـنین کـە شـیعری تـورکیش زیـاتر لەبازنـەی پەیامداریـدا سـووڕاوەتەوە و لـە چوارچێوەی ڕێبـازی (هونـەر بۆکۆمـەڵ) دا ڕووەو بابـەتی سیاسـی و نیـشتمانی و کۆمەڵایـەتی هەنگاوی گەورەی ناوە.

---

١- قصائد مختارة من الشعر التركي المعاصر: ص ٢٩.

٢- اشارات اولية في الشعر التركي: ص ٦١

٣- قصائد مختارة من الشعر التركي المعاصر: ص ٣٤.

٤- اشارات اولية في الشعر التركي: ل ٦٦ — ٦٧.

(*) بروانە (اشارات اولية في الشعر التركي): ل ٦٩ — ٧٠.

وەك ئاشكرایە شیعری كلاسیكی كوردیمان بەچوار زار بەرهەم هێنراوە و گەشەی شیعری لەچوارچێوەی ئەو زارانەدا تارادەیەك سەربەخۆ دەبینرێن هەر بۆیە لێكۆڵینەوە لەهەر دیاردەیەكی شیعری كلاسیكی پێویستی بەوە هەیە كەبە جیاجیا لەشیعری سەربەو زارانە بدوێنین بۆیە ئێمەش لێرەدا و دەربارەی ئەركی شیعری لەقۆناغی كلاسیكیدا یەكە یەكە سەرنج ئاراستەی بەرهەمی شیعری سەربە زارەكان دەكەین.

## أ- ئەركی شیعر لەزاری لوری دا:

دیارترین شاعیری سەربەم زارە كە بەرهەمیمان لەبەردەستا بێت، بابەتاهیری هەمەدانییە. وەك دەریش دەكەوێ لەبەر ئەوەی بابەتاهیر خۆی مرۆڤێكی سۆفی بووە هەر بۆیە بەرهەمەكانیشی لەبازنەی سۆفیگەرییێتیا ماونەتەوە و: ((ئاشكرایە بابا پیرێكی بەویژدان و لەخواترس و زانا و شارەزای زاراوەكانی سۆفیگەری بووە، ئەم خواناسە بالآتر لە بۆچوونی ماددی و چەن و چوونی ئاسایی رێگای گرتۆتە بەر و رادەی بیر و هۆشیشی بەرزتر بووە لەهاوشان و دۆستەكانی)) [1]

لەبەر ئەوە دیارترین بابەتی شیعری لەبەرهەمەكانیدا شیعری ئایینی بووە و: ((شوناسی ئایینی لای ئەو لە سەرووی هەموو شتێك بووە)) [2] هەر بۆیە دەڵێ:

**گەر ئەژ زەر ئەو نەهی دیوانە ئەز گل**
**بەپەر چینەش كری وا نووشەوو ول**
**گەرئەو بشنەش نەهی ئان داری شمشاد**
**گەر ئەو روونەش كری ئاواجی بلبل**
**سەرەنجامان بشی بەپا بەهەرزی**
**پایی تە گوور وی ماوایی تەگل** [3]

---

١- وشە و زاراوەكانی بابا تاهیر و بەراوردكردنیان لەگەڵ شێوەكانی زمانی كوردی، دكتۆر محمد نوری عارف، چ. وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر، ١٩٩٧: ل ٧-٨ .

٢- چەمكی شوناسی لە شیعرەكانی بابا تاهیری هەمەدانی دا، ئارام سدیق رۆڤار، ژ (٣٨)، چ. رەنج، سلێمانی، ٢٠٠٦/٢/١٥: ل ٥٥ .

٣- مێژووی ئەدەبی كوردی، بەرگی یەكەم، لەسەرەتاوە تا سەدەی چوارەم، چاپی یەكەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ١٩٦ .

بـەم پێیـە زۆربـەی چـوارینەکانی لەچوارچـێوەی ئـەرکی ئـایینی دا ماونەتـەوە و هـەڵگری پەیامێکی ئایینی بوون.

دیارە لەو سەردەمەی باباتاهیردا بەکارهێنانی زارە لـوری یەکـە لەبەرهـەمهێنانی شـیعریدا بۆخۆی دیاردەیەکی سەرنج ڕاکێش بووە، بۆیە گەلێ لەنووسەران ڕایان وایە کە نووسـینی شـیعر بە کـوردی لای باباتـاهیر ڕەنـگ پێـدەرەوەی هەسـت و سـۆزێکی کوردانەیـە و لەگـەڵ سـادەیی دەقەکانیشدا: ((وەکو هەر تاکێکی کورد لەو سـەردەمە دێرینـەی ژیانـدا لەکوردسـتان جـەختی لەسەر کورد بوون کردۆتەوە و هەوڵی ئەوەشی داوە ناسنامەی ناوچەکەی خۆیشی بخاتـەڕوو)). [1] وەك دەڵێ:

**ئەز ئان ئەسبیدە بازم هەمەدانی**
**بەتەنهایی کەروم نەچیرەوانی**
**هەمە بەمن ویدیدەندچرغ و شاهین**
**بەنامی من کەرەند نەچیرەوانی** [2]

دیارە ئەو چەشنە ئەرکە ئایینەشی کەلـە دەقـەکانی باباتـاهیردا دەبینـرێ وەك خـۆی ڕووەو ئامۆژگاری کردنی مرۆڤ ئاراستە کراوە کە چاکەخواز و خێرخواز بـن لەژیانـدا و لـە سەرچـاوەی ئایینەوە توێشوی ڕاستییەکانی ژیان بەدەست بهێنن.

## ب – ئەرکی شیعر لەزاری گۆران دا:

ئاشـکرایە کـە زاری گـۆران بـۆ ماوەیـەکی زۆر زمـانی ئـەدەب بـووە و بەرهـەمی شـیعری زۆریـشی پـێ نووسـراوەتەوە و: ((سـەرەتای ئـەدەبی کـوردی نوسـراو واتـە شـیعری کلاسـیکی بەدیالێکتی گۆرانی بوو. بێگومان هۆی هەرە گەورەی پێشکەوتنی ئەم دیالێکتە لە ڕۆژگـارانی مێژوودا ئەوەبوو کە بابا ئـەردەڵان میرنـشینی لەسـەدەی چـواردەمی مەسـیحیدا دروسـت کـرد بایەخێکی زۆری بەلایەنی زانستی و ئـەدەب و هونـەر دەدا، زمـانی ئـەو میرنـشینە دیـالێکتی

١- چەمکی شوناس لەشیعرەکانی بابا تاهیری هەمەدانی دا، ئارام سدیق، ڕۆڤار، ژ(٣٨)ی ١٥ /٢ / ٢٠٠٦،: ل ٥٥ .

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی، لەسەرەتاوە تا سەدەی چواردەهەم، د. مارف خەزنەدار، بەرگی یەکەم، ل ٢٠٢ .



گۆرانی بوو، جگە لەمە دیالێکتی گۆرانی زمانی ڕەسمی ئـایین و ئـایینزا و عـەقیـدە شـاراوەکان بوو لەو ناوچانەی هۆزەکانی گۆران کردبوویان بە مەڵبەندی ژیانیان)) [1]

شاعیرانی هەورامی لـە ڕێگـەی بابـەتی شـیعری ئـایینی و لاوانـەوە و دڵـداری و وەسـف و هەندێك بابەتی ئامۆژگاری و کۆمەڵایەتی و چیرۆکە شیعردا ڕەنگیان بە ئەرکەکانیان بەرامبـەر بە ژیان داوەتەوە.

شیعرەکانی (پیرشالیار) کە شاعیرێکی هەورامی و سەر بە ئایینی (ئەهلی حـەق) یارسـانە: ((کتێبێکی ئامۆژگاری و دانایی لەپاش بەجێ ماوە بەناوی (ماریفە تۆ پیرشالیار))) [2] هـەروەك لە شیعرێکیدا دەڵێ:

**گۆشت جەواتەی، پیرشالیار بۆ**
**هۆشت جەکیاستەی زانای سیمیار بۆ** [3]
**هەروەها دەڵێ:**
**داران گیان دارەن، جەرگ و دل بەرگەن**
**گایێ پڕ بەرگەن، گایێ بێ بەرگەن**
**کەرگە جەهێلێن، هێلێ جەکەرگەن**
**ڕەواس جەرەواس، وەرگێ جەوەرگەن** [4]

دیارە کە شیعرە کلاسیکییەکانی سەر بەزاری گۆران زیاتر لە شیعری زارەکانی تری کـوردی ئەرکی ئایینییان پێ بینراوە: ((وەك زانراوە کە شیعری گۆرانی لەسـەرەتادا بـە بابـەتی ئـایینی دەستی پێ کردووە لە هەموو قۆناغەکاندا وەك بابەتێکی فراوان و سەرەکی دەرکەوتووە)). [5]

١- مێژووی ئەدەبی کوردی، سەدەکانی چواردەهەم — هەژدەهەم، د. مارف خەزنەدار، بەرگی دووەم: ل ١٢ .

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی لەسەرەتاوە تا سەدەی چواردەهەم، بەرگی یەکەم: ل ٢٣٧ .

٣- سەرچاوەی پێشوو: ل ٢٣٨ .

٤- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم: ل ٢٣٩ .

٥- بیری نیشتمانی و گیانی نەتەوەیی لەشیعری دیالێکتی گۆراندا، د. محەمەد ئەحمەد سەعید، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، بەشی B ، ژ (١٢)، سلێمانی، کانوونی یەکەم ٢٠٠٣: ل ١٣٤ .

هەروەك لای (شاخۆشێن ١٠١٥ – ١٠٧٤ ز)ی شاعیر دەبینین کەلە بارەی ئایینی یارسانەوە دەڵێ:

**یارسان وەرا، یارسان وەرا**
**وای هەق راستی یەن، برانان وەرا**
**پاکی و راستی و نێوەکی و ردا**
**قەدەم وە قەدەم، تاوە مەنزلگا**[1]

لە گۆشەیەکی تری ئایینەوە شاعیرانی گۆران بە شیعرەکانیان نوێنەرایەتی مەزهەبەکانی ئایینی ئیسلامییان کردووە، وەك لە کتێبی (سەرەنجام)دا کە کتێبێکی ئایینییە و لەچەند سروودێك پێك هاتووە و لە دانانی (سولتان ئیسحاق)ە، لەسروودی حەوتەم لە ستایشی (ئیمامی عەلی) دا دەبینین، دەڵێ:

**ئەووەل ئاخیر یار**
**بو وانام سەنای ئەووەل ئاخیریار**
**یار یەعنی مەولام ساحیب زولفەقار**
**ئوستادی ئەزەل ژبەر تاوەبار**[2]

مەلا پەرێشانیش: ((کە لەسەر ئایینزای شیعی ئایینی ئیسلام بووە)) لەخوا دەپارێتەوە کە لەبەر خاتری ئیمامی (عەلی) لەگوناهەکانی ببوورێ و دەڵێ:

**خدا من بنده ناچیز و ذلیل　　　گنام کثیرا طاعتم قلیل**
**چنیم عدالت مگر ای کریم　　　بەبخشم و لطف بفضل عمیم**
**حکیم حلیم کس سرنزان کس　　　علی عظیم ذات ویثن بس**
**لالای الحاح من بکر قبول　　　یاحق و عصمت فاطمه بتول**[3]

١- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم: ل ٢٣٩ .

٢- لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردییەوە، دکتۆر مارف خەزنەدار، چ. (المؤسسة العراقية للدعاية والطباعة)، بەغدا، ١٩٨٤ : ل ١٠٣ .

٣- دیوانی مەلا پەرێشان، گرد ئاوەندە، ناشر فتح علی حیدری، زیبا جوئی، کرمانشاه، ١٩١٦: ل ٧٣ .



هەر لەو روانگە مەزهەبییەوە لە رەنگدانەوەی کارەساتی شەهید بوونی (حسین) لە شیعرەکانی (مەلا پەرێشان)دا دەبینین دەڵێ:

**شهید صحرای کربلا حسین　　　وبلای عظیم مبتلا حسین**
**وارث علوم انبیا حسین　　　قتیل حربه اشقیا حسین**[1]

هەروەها مەلا پەرێشان لە ستایشی پەروەردگارا دەڵێ:

**یارب تو رزاق روزی خارانی　　　منشأ سحاب قطره بارانی**
**رب الارضین هفت سماواتی　　　ممیت الاحیا محیی الامواتی**[2]

ئەرکی دڵداری لە شیعری زاری گۆران دەربڕینی هەست و سۆزی راستەقینەی ناخی شاعیری پێ بینراوە، وەك لە خۆشەویستی و پەرۆشی (بێسارانی)دا دەبینرێ، دیارە کە بەشێکی زۆر لەناوەرۆکی شیعری بێسارانی رەنگدانەوەی بابەتی دڵدارییە: ((ئامینە ناوێك لەدێی پایگەلان هەبووە کە بەشێکی تەواوی هەبووە لە هەڵقوڵینی سەرچاوەی شیعری مەلا مستەفا دا و پشتیوانێکی بەهێزی بووە کە خەیالی وردکاری بکەوێتە کەللەیەوە و لە پەردەی شیعردا دەری برێ)).[3]

**چلێ نەپەنا، چلێ نەپەنا**
**چلێ چون رەقیب مداران نەپەنا**
**هور ئامان مداران نەرووی تەمەنا**
**مەرباد قۆرەت لەتار لەتار بو**
**نازۆ باڵای قیبلەم دیار بۆ**
**بسوچو باهر بازەدەی سەحەر**
**ریشەش جە زەمین بەر بارۆ وەبەر**
**تالا بالای قیبلەم چون شەم خانان**
بونیوون بەچەم نەبەرزە بانان[4]

١- هـ. س: ل ٥٣ .

٢- دیوانی مەلا پەریشان: ل ٥٨ .

٣- مێژووی ئەدەبی کوردی، علاء الدين سجادی: ل ١٨٣ .

٤- دیوانی بێسارانی ئامادەکردن و ساغ کردنەوەی سەدیق سەفی زادە، چاپی یەکەم، چ. رستمخانی، ناشر، انشارات کردستان، سنندج: ل ١٢٩ .

(وەلی دێوانە)ش لەدووری یارەکەی دەناڵێنێ و لە دەربڕینی هەست و سۆزی خۆی بەرامبەر بەخۆشەویستەکەی: ((سەرچاوەی هۆنراوەکانی و قیبلەی هۆنراوەی و دەست پێ کردنی و رێك خستنی و دارشتنی و پیا هەڵدانی هەموو ئەگەڕێتەوە بۆ سەر ئەوکچەی کە سەودا سەری بووبووە کە ناوی – شەم – بوو))[1] دەڵێ:

**ئەر لەحزەی نامت فەرامۆشم بوو**
**سۆزی سەودای تۆ من خامۆشم بوو**
**زوانم پارەی تیغی ئەلماس بوو**
**دەروونم لەت لەت گشت بەپەلاس بوو**[2]

ئەگەر بمانەوێ بەدوای باس و وێنەی سروشت و جوانی دیمەنەکانی کوردستان و وەسفێکی وردی وەرزەکانی ساڵ لە کوردستان دا بگەڕێین، ئەوا دەبێت چاو بەشیعرەکانی سەربەزاری (گۆران)دا بخشێنین، کەبە جوانترین دەقی شیعری هەست و سۆزی خۆشەویستی خۆیان بەرامبەر بەکوردستان بەوەسفی دیمەنەکانی دەربڕیوە:

(بێسارانی) لەوەسفی گول و گوڵزاردا دەڵێ:

**چراغ وەنەوشە چنوور چەنی گول**
**عەزم رای ویصال تۆشان هانە دل**
**چنوور جەسەرکۆ وەنەوشە جە چەم**
**گول جە گولستان وە هەم بیەن جەم**[3]

(وەلی دێوانە) بەخەیاڵێکی رۆمانیسانەی رەشبین خەمی دڵی لەناو وەسفی گوڵ و گوڵزاری بەهاردا بەشیعرێکا رەنگ پێ دەداتەوە:

**یاران نەوبەهار یاران نەوبەهار**
**ئیمسال لەبەختم بێ شەوقە بەهار**

١- دیوانی وەلی دێوانە، کۆکردنەوەی مەحموود خاکی، چاپی دووەم، چاپخانەی سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٣: ل ٨ .
٢- هـ. س: ل ١١ .
٣- دیوانی بێسارانی: ل ٨٦ .



**گوڵ سەری کێشا لەتۆی پەردەی خاك**
**گشت گولێ خەندان دیدەی من نمناك**
**هەرگوڵ خونچەیی بۆ من پەیکانێ**
**هەر پەرەی گولێ دڕکی هیجرانێ**[1]

دیارە کە وێنەی مەولەوی کەمە لەوێنەکێشانی سروشتی نیشتمان و وەرزەکانی ساڵ: ((باخ و گوڵزاری شیعری مەولەوی ئەوەندە کەش و نازدارە شایانە هەرچی شیعر دۆستە بەشاگەشکەبییەوە بچێتە سەیری، بەڵام ئەوەندەش بەرزەنرخە هەموو کەس ناتوانێ ببێتە سەودای گولە مرواری و گەوهەرەکانی))[2] مەولەوی جوانی ناس بۆ دەربڕینی دەقێکی جوان هاتووە بەپێچەوانەی شاعیرە کلاسیکەکان کە جوانی یارەکەیان بەجوانی سروشت دەچواند، ئەو جوانی سروشتی بەجوانی یارەکەی چواندووە، بۆیە گول لە سووری و جوانیدا بەرووی یارەکەی دەچوێنێت و دەڵێ:

**نازك تەدارەك فەصل وەهاران**
**شیرین ئارایش هەردەو کۆساران**
**گول چون رووی ئازیز نەزاکەت پۆشان**
**وەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان**[3]

بەتێڕوانینی مەولەوی تەنانەت وەرزی زستانیش جوانی و چێژی خۆی هەیە: ((خۆشەویستی بێ سنووری مەولەوی بۆ سروشتی نیشتمانەکەی، لەشیعرەکانیدا بەشێوەیەکی دیار و کاریگەر رەنگی داوەتەوە و بڕبڕەی سیستێمی وێنەی شیعری شاعیرن، سروشت دەربڕی بیر و ئەندێشە و ژانی مرۆڤی سەردەمەکەیەتی مەولەوی تابلۆی سروشت بەشێوەیەکی بزواو

١- دیوانی وەلی دێوانە: ل ٢٣ .
٢- خوێندنەوەیەکی تازەی هەڵبەستی کوردی، عەبدولڕەزاق بیمار، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦: ل ١٨٥ .
٣- دیوانی مەولەوی، پێداچوونەوە و رێك و پێك کردن و زاید کردنی شیعرە چاپ نەکراوەکان، حەسەن گۆران، موحەمەد حیجازی، چاپی یەکەم، دەزگای رۆشنبیری گۆران، سنە، ٢٧٠٤ کوردی: ل ٥٢٢ .

دینامیکی و هارمۆنی نیگارکێش دەکا، بەدوای پێکەوە گرێدانی دیاردە جیاجیاکانی دەوروبەرو واقیعەکەیدا دەگەڕێ))[1] بۆیە دەڵێ:

**زوسانەن، وەی ڕەنگ وەگەردوون یاوان**
**گێجیای لول گێج کلێلەی کاوان**
**بەنا باشی بورج بەرزە دیاران**
**سفید کاری کەرد تاقچەی موغاران** [2]

ئاشکرایە کە شیعری کلاسیکی زاری گۆران ئەدەبێکی دەوڵەمەندە لەچیرۆکە شیعر. زۆرجار لەچیرۆکە شیعرەکاندا ئەرکی دەبڕینی هەستی ئایینی بە ئاوێتەکردنی بە هەستێکی ناسکی خۆشەویستی ڕۆمانسییانە هەروەها لەگەڵ دەربڕینی چەندین بابەتی تر، کەلەناو یەك چیرۆکە شیعردا بینراوە. دیارە کە ئەم دیاردانە لە چیرۆکە شیعری (شیرین و خوسرەو)دا کە لە نووسینی (خانای قوبادی)یە، دەکەوێتە بەرچاو: ((... ئەوەی ئەم داستانە ئەخوێنێتەوە لە هەستی شانازی خانا بەخۆی، بەکورد، بەکوردستان ئاگادار ئەبێ.. بە باوەری لەبارەی ستەم و دادپەروەری و جۆری حوکمرانی و ڕژێمی کۆمەڵایەتی ئاشنا ئەبێ.. هەڵوێستی دەربارەی ئافرەت و خۆشەویستی و بەسەربردنی ژیان و گەلێ بابەتی تری واوە بۆ دەرئەکەوێ..)) [3]

دیارە (خانا) لە کۆکردنەوەی کۆمەڵە بابەتێك لە چیرۆکە شیعرێکی وادا مەبەستی دەربڕینی کێشە و گیروگرفتەکانی کۆمەڵی کوردەواری ئەوسا و هەروەها لەهەمان کاتدا دەربڕینی دەقێکی جوانی ئەدەبی بە زمانی کوردی بووە: ((پێوانەی خانا بۆ شیعری سەرکەوتوو بریتییە لەوە لەبارەی ناوەڕۆکەوە بێ مەعنا نەبێ، لەڕووی داڕشتنەوە رازاوە و جوان بێ...))[4].

---

١- لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ئەنوەر قادر محەمەد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠١ : ل ١٠٩ .

٢- مەولەوی و سروشت، عەلی شێخ عومەر قەرەداغی، چ. کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨ : ل ٢٢ .

٣- شیرین و خوسرەو خانای قوبادی، محەمەدی مەلا کەریم ساغی کردووەتەوە و فەرهەنگی بۆ ڕێك خستووە و پێشەکی بۆ نووسیوە، چ. کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥: ل ١١ .

٤- هـ. س : ل ٢٤ .



**وێنەی عوروسان زیبای موشك چین،**
**بکەرۆش جە حوسن عیبارەت شیرین،**
**کریا بو چون شیعر (جامی) مەوزونش** [1]

خانا لەدەربڕینی هەستی خۆشەویستی بەرامبەر بە نەتەوەکەی و شانازی کردن بەزمانی کوردی و هەروەها ئامۆژگاری و هاندانی ڕۆڵەکانی کورد بۆ مەبەستی بزواندنی هەستی نەتەوەیی و فێربوون و خۆشەویستی زمانی زگماکی خۆیان و چەسپاندنی زمانەکە لەدل و دەروون: ((ئەم ئەرکەش لە هەستێکی خاوێنی نەتەوە پەروەری و شانازی کردن بەکورد و کوردستانەوە ئەخاتە ئەستۆی خۆی و ئەلێ هەرچەند فارسی زمانێکی وەك شەکر شیرینە، کوردیش لە فارسی شیرین ترە و پێویستە لەم دونیای بەد ڕەفتارەدا (کە تا ئێستا ڕێی بەکارهێنانی زمانی خۆماڵی لێ گرتووین) هەرکەس ئەو زمانەی خۆی بەکاربێنێ کە خوا پێی داوە و...)) [2]

**راستەن مواچان فارسی شەکەرەن**
**کوردی جە فارسی بەڵ شیرین تەرەن**
**پەی چێش ؟ نەدەوران ئەی دنیای بەدکێش**
**مەحظوظەن هەر کەس بەزوبان وێش**
**مەعلومەن هەرکەس بەهەر زوبانێ**
**بوا چۆ نەظمێ جە هەرمەکانێ**

هەر لەو بەرهەمەیدا (خانای قوبادی) لەڕوانگەی ئەرکێکی نیشتمانییەوە ئاماژە بەوە دەکا کە هۆی نووسینی داستانەکەی بۆ ئەوەیە کە داستانێکی شیعری بەزمانی کوردی کە لە ڕێزی داستانی (نیزامی) فارسی بێت بۆ خەڵکی کوردستان بهۆنێتەوە تابیر و ڕۆشنبیری و ئەدەبیاتی کوردی پێ دەوڵەمەندتر بێت: ((خانای قوبادی لێرەدا بیر و هەڵوێستێکی نیشتمانی و نەتەوە پەروەرانە پاڵی پێوە ناوە، کەوای کردووە بیگۆڕێتە کوردی و ڕواڵەتێکی کوردانەی پێ ببەخشێ

---

١- هـ. س: ل ٢٤ — ٢٥ .

٢- شیرین و خوسرەو، خانای قوبادی: ل سیانزە — چواردە .

و تەواوی خەلکی کوردستان چێژی لێ وەربگرن، ئەم ئەرك و کارەش لەهەست و خرۆشێکی پاکی نیشتمانی و نەتەوە پەروەرانەوە هەلقولاوە، ئەو شانازی کردنەی بەکورد و نیشتمانەکەیەوە راشکاوانە دەربڕیوە)). [١]

**جەعەرصەی دنیای دون بەد فەرجام**
**بەدەستور نەظم (نیظامی) مەقام**
**بەلەفظ کوردی کوردستان تەمام**
**پێش بوان مەحظوظ باقی (والسلام)** [٢]

هەر لەو چیرۆکە شیعرییەدا جگە لە دەربڕینی ئەوینێکی پاکی بێ گەرد، ئەرکی ئامۆژگاری و دادپەروەریشی تیادا دەبڕیوە:

**بەسەمع شەریف بشنەو حیکایەت**
**ئەر قەصدش خێرەن والی ی ویلایەت**
**بەجای گول زەمین ماوەڕۆ گەوهەر**
**سەنگ مبۆ بەلاڵ، خاکش بەعەنبەر** [٣]

هەروەها ئەرکی دەربڕینی هەستی ئایینی و ئازایەتی و خۆڕاگری و ئارامی و چەندین بابەتی تری بەپێز ئاوێتەی ئەم چیرۆکە شیعری دلّدارییە کراوە.

هەروەها خانای قوبادی لەچیرۆکە شیعری (یوسف و زلێخا)دا کە (حەکیم مەلا سالح) بەرۆمانە شیعر * ناوی دەبا، بەوپەری لێهاتوویی و شارەزاییەوە ئەرکی دەربڕینی دەقێکی شیعری بەهێز بەزمانی کوردی بەپەنا بردنە بەر چیرۆکی قورئانی پیرۆز ببینێ، کەواتە خانا

١- بیری نیشتمانی و گیانی نەتەوەیی لەشیعری دیالێکتی گۆراندا، د. محەمەد ئەحمەد سەعید، گۆڤاری زانکۆی سلیمانی بەشی B ، ژ (١٢)، کانوونی یەکەم ٢٠٠٣: ل ١٣٦ .

٢- شیرین و خوسرەو خانای قوبادی، محەمەدی مەلا کەریم ساغی کردووەتەوە و فەرهەنگی بۆ رێکخستووە و پێشەکی بۆ نووسیوە: ل ١٥ .

٣- هـ. س: ل ١٦ .

(*) بڕوانە یوسف و زلێخا، بەرهەمی خانای قوبادی، بووژانەوە و لێکدانەوەی حەکیم مەلا سالح، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦: ل ٣ .



لێرەدا مەبەستی دەربڕینی دەقێکی ئایینی بەزمانی کوردی بینیوە، واتا بەستنەوەی ئەرکی ئایینی بەئەرکی نەتەوەیی پیشانداوە:

**سەرِ ڕاڤی لاڵ سەنج دەریای مەعانی**
**گۆش بدەر بەسونع دانای ڕەببانی**
**بەقەولی ڕاویی تەواریخ بەستە**
**بەی تەورو یەردەن بەستەو شکەستە**
**جەسولبی ئادەم ئاماپشت بەپشت**
**گولێ جە گولزار یەعقوب کەرد سرشت**
**نامش بەیوسف میسری موانان**
**جەمالش چون خۆر چوارەمی ئاسمان** [١]

هەروەها لە چیرۆکە شیعری (جەنگی کوللە و ئاییـنەمەل)ی میرزا قادری پاوەیی ١٨٤٦ — ١٩٠٩، شاعیر لە رێگەی تەم و مژی یەوە ئەرکی دەبڕینی کێشەیەکی کۆمەڵگای کوردەواری بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بینیوە: ((مەبەسی میرزا قادر داهێنانی کارێکی ئەدەبی ڕەمزی بووە، ناوەڕۆکی زیاتر لە ماناییێك هەڵبگرێ)) [٢]

شاعیر لەخوا دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی لەدەست زۆرداری و خراپەکاری و زیانی کردەوەکانی کوللە رزگاریان بکات، دیارە لێرەدا کوللە بووە بە ڕەمز بۆ هەموو مرۆڤێکی خراپ و خراپەکاری تەنانەت ئەم خراپەکارییە ڕوو لە فراوانی دەکا و ڕژێم و دەسەڵاتی سیاسیش دەگرێتە خۆی:

**یامالیکە لمولك سەماو سەربسات**
**جە دەست مەلەخ پێمان دەی نەجات**
**مەعلومەبێ تۆ پەشێوەن حالم**
**یە جەور مەلەخ یەجەفای زالم**

١- هـ. س: ل ٢٥ .

٢- چیرۆکی شیعریی (جەنگی کوللە و ئاینە مەل)ی میرزا قادری پاوەیی، د. مارف خەزنەدار ئەکادیمی، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردستان، ژ (١)، ، ٢٠٠٢: ل ٢٤٧ .

یەك رۆبێ خەوەر مەخلووق پاوە
چێش مەنزل بەگێ ئاما جەلاوە
تیپێ چون جەیحوون مەلەخ نمانا
عالەم هۆش کەرۆ وەهیچش زانا [1]

ئەرکێك لە ئەرکەکانی تری شیعری هەورامی ئەرکی لاوانەوەیە کە بەهەست و سۆزێکی ناسك بابەتی لاوانەوەی کردووە بە بابەتێکی شیعری.

(وەلی دێوانە) کاتێ خۆی بەنامۆیی دەبینێ لە دووری یارەکەی دەست دەکا بە لاوانەوەی خۆی و دەڵێ:

چۆل نشینە خۆم چۆل نشینە خۆم
چون قەیسی مەجنون چول نشینە خۆم
ئارەزوو مەندی دوور بێ یانە خۆم
رەفیقی وەحشی وێران یانە خۆم
دوور کەفتەی وەتەن هەراسانە خۆم
مەحرومی مەجلیس گشت خاسانە خۆم [2]

دیارە کە شیوەن و لاوانەوە زیاتر بۆ لەدەست دانی کەسانێکی ئازیز و لەدڵا شیرین دەگوترێ بۆیە مەولەوی لە خەمی کۆچ کردن و دوورکەوتنەوەی (عەنبەر)ی خێزانی شیوەن دەکا و: ((مەولەوی لە شیعری کوردیدا دیاردەیەکی نوێی هێناوەتە ئاراوە، خۆشەویستی شتێکی رووت و ئەبستراکت نییە، ئافرەتێکی بەخەیاڵی شاعیر خولقێنراو نییە، هاوسەری شاعیرە، ناوی عەنبەر خاتوون بۆتە رەمزی وەفا و خۆشەویستی و تەنانەت نیشتمانیش)). [3]

١- هـ. س: ل ٢٤٩ .

٢- دیوانی وەلی دێوانە: ل ١٢ .

٣- لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی: ل ١٥١ .



دڵەی دل وەمەی مەیل لەیلی کەیل
مەحرەم وەرازان خەلوەت خانەی لەیل
لانەی حەڵقەی زولف عەنبەر بۆی شەو رەنگ
هام دەم جای تەنگ ئەلحەد سەرای سەنگ [1]

مەولەوی تەنانەت بۆ درەبڕینی وەفا و هاوبەشی کردنی خەمی هاوڕێیانیشی شیوەن دەکا: ((مەولەوی ئاوڕی لە داب و نەریتی ژیانی کوردەواری داوەتەوە و گەلێ دیمەن و بابەتی ئەمانیشی بەکارهێناوە، بۆ نموونە هەندێ وردەکاری لەدیمەنی شین و شەپۆڕی ولاتەکەی خستۆتە ناو شیعرەکانییەوە، بۆ وێنە وشەی (رۆ)ی دووبارە کردۆتەوە، مەولەوی بە وێنەی پڕ ئیستیعارە و بەراورد و میلۆدییایەکی خەمبارەوە، کەش و هەوای کۆڕی پرسەمان لە شیعرەکانیدا نیشان دەدا، کە دەیانخوێنینەوە گوێمان بەدەنگی (رۆ ! رۆ ! داد) و شین و شەپۆر دەزرنگێتەوە و دەچینە دونیای پرسە و کۆڕی ماتەمەوە و دەبینە هاوبەشی خەم و پەژارەی کۆست کەوتوان)). [2]

مەولەوی لەسەر زوبانی هاوڕێکەی شیوەن بۆ کۆچی کوڕەکەی دەکا و دەڵێ:

پزیسکەی چەخماخ کافی کارمەن
چ وەخت و وادەی ئەی گوفتار مەن
.........................................
پەردەی سەبووریم دڕیا، رۆڵە رۆ
ریشەی جەرگەکەم بڕیا رۆڵە رۆ
وەناکام هیجرەت کەردەم رۆلە رۆ
داخان گشت وەخاك بەردەم رۆلە رۆ

١- دیوانی مەولەوی، پێداچوونەوە و رێك و پێك کردن و زاید کردنی شیعرە چاپ نەکراوەکان، حەسەن گۆران، موحەممەد حیجازی: ل ٣١٠.

٢- لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی: ل ١٥٦ — ١٥٧ .

ئەمجارە ستایشی کوڕە کۆچ کردووەکە ئاوێتە بەلاوانەوەکە دەکا و دەڵێ:

**کام وەسفت خەیاڵ، کام شێوەت یادکەم**
**پەی کام خەسلەتت دادو فەریاد کەم**
**پەی عەقیدە و دین موسلمانیت، داد !**
**پەی شێوەی شیرین نەو جوانیت، داد !** [1]

هەر لە ئەدەبی گۆراندا دەبینین لەڕێگەی نامەی شیعرییەوە ئەرکی سیاسی بەشیعر بینراوە، وەك لەو نامە شیعرییەی (ڕەنجووری)دا دەبینرێ و تیایدا ((وشەی کوردستان وەك حوکمرانی و دەسەڵاتێك ناوی هاتووە. بە ویلایەت ناوی بردووە، کە وێنەیەکی واقیعی کوردەواری ئەو قۆناغەیە کە کوردستان دەسەڵاتێکی کوردی تێدا سەقامگیر بووە سەرکردەیەکی نیشتمانپەروەر بەڕێوەی بردووە، ئەمە هەم هەستێکی نیشتمانی بەرامبەر کوردستان هەم بەرامبەر دەسەلاتی کوردی و سەرکردەکەی. گەر تەواوی چامەکە لێك بدەینەوە دەرئەکەوێ پڕە لە دەربڕینی گیانی نیشتمانی. سۆز و ئەوینێکی راستەقینەی ڕەنجوریمان بۆ دەرئەکەوێ.)) [2] لە ئاکامی بزواندنی هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی سۆز و دڵسۆزی بەرامبەر بە پاشای کورد (عەبدولڕەحمان پاشای بابان) لەکاتی بەندێتییەکەی، (ڕەنجوری) نامەکەی بەبای شەماڵ رادەسپێرێ و دەڵێ:

**دەور بدەر نەمولك (بابل) بێ ئەندێش**
**بشۆ وەجایێ (حیللە) ماچان پێش**
**شەهزادێ جە نەسل بەگزادەی (بابان)**
**جەنەوەی ئۆجاغ مالیك ڕیقابان**
**والی ویلایەت (گشت کوردستان)ەن**
**ئیسم شەریفش (عەبدورەحمان)ەن**
**ستارەی بەختش قیران نەحسەن**

---

١- دیوانی مەولەوی: ل ١٣٨ — ١٣٩ — ١٤٠ .

٢- بیری نیشتمانی گیانی نەتەوەیی لە شیعری دیالێکتی گۆراندا، د. محەمەد ئەحمەد سەعید، گۆڤاری زانکۆی سلێمانی بەشی B ، ژ (١٢) ی کانوونی ٢٠٠٣: ل ١٣٦ .



**جە (حیلە)ی دنیانە (حیللە) حەبسەن** [1]

لەڕێگەی ئامۆژگارییەوە هەندێك لە دەقە شیعرییەکانی زاری گۆران ئەرکی کۆمەڵایەتییان پێ بینراوە.

مەلا پەرێشان لە خستنەڕووی نەریتی خراپی سۆفییەکان لە بەکارهێنانی ئایین بۆ سوود و بەرژەوەندی کەسی خۆیان و سیفەتی لووت بەرزی ئادەمیزاد، دەڵێ:

**وە مەزهەب حەقیر دوو هۆزن کافر**
**یەکی سۆفییە، یەکی موتەکەبر**
**لێکن وەمەعنا سووف پەشم پووشا**
**کیلاب و سیباع دەواب وحووشا**
**تاریکو سەلات مالی مەردم خوەر**
**یەمەعنای سۆفییە، وێنە سەگ و خەر** [2]

(بێسارانی)یش لە شیعرێکیا ئەرکی کۆمەڵایەتی بە خستنەڕووی داب و نەریتی ڕێزگرتن لەکەسانی ئاوارە و لێقەوماوان و پێویستی یارمەتی دانیان بەپێی توانا و بەستنەوەی ئەم داب و نەریتە بەلایەنی ئایینی، بینیوە:

**چراغ نەدلەن، چراغ نەدلەن**
**هەرکەس غەریبەن هەرداخ نەدلەن**
**دلەی غەریبان شکل گول دارۆ**
**کافر ئەو کەسەن غەریب ئازارۆ**
**هەرکەس بکەرۆ غەریب نەوازی**
**بێ شك خوداوەند لێش مەبۆ رازی**
**هەرکەس مەگێرۆ غەریبان عیززەت**
**پەی وێش مەسازۆ جایێ نەجەننەت** [3]

---

١- دیوانی ڕەنجووری، (مەلا عومەری زەنگەنە)، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەکەم، چ. (افاق عربیە)، بەغدا، ١٩٨٣: ل ٢٠٥ — ٢٠٦ .

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی لە سەدەکانی چوارەم — هەژدەهەم، بەرگی دووەم: ل ١٨ .

٣- دیوانی بێسارانی: ل ٨١ — ٨٢ .

لێرەوە دەتوانین بڵێین ئەدەبیاتی زاری گۆران هەر لە سەرەتای بوونینەوە تاسەردەمی کزبوون و لاواز بوونی لە ژێر سێبەری ئایینەوە ئەرکەکانی تری رەنگ پێ داوەتەوە: ((ئەستێرەی بەختی دیالێکتی گۆرانی بەرەو کزبوون و رژان دەڕۆیشت لەو کاتەی کە بزووتنەوەی شیعری نوێ لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لەسەر دەستی نالی لەناوچەی سلێمانی سەری هەڵدا. لەو سەردەمەدا عەبدولڕەحیمی مەولەوی (١٨٠٦ – ١٨٨٢) لووتکەی شیعری کلاسیکی دیالێکتی گۆرانی بوو، ئیتر بەرەو کزبوون کەوتەڕێ و شاعیرێکی وەکو مەولەوی لەدوا رۆژدا پێشکێش نەکرد، لەگەڵ ئەوەی تا ئێستاش دیالێکتی گۆرانی هەرماوە و کۆتایی نەهاتووە.))[1]

### ت – ئەرکی شیعر لە زاری کرمانجی ژووروودا:

وەك ئاشکرایە شیعری سەر بەزاری کرمانجی ژووروو بوارێکی تری دەوڵەمەندی ئەدەبی کوردییەو کۆمەڵێ شاعیری ناودار (مەلای جەزیری، فەقێ تەیران و ئەحمەدی خانی و...هتد) بەرهەمیان خستۆتە بەردەست.

ئەگەر سەیرێکی شیعرەکانی ئەم شاعیرانە بکەین، دەبینین کۆمەڵێ ئەرکی دیاری شیعرییان پێ بینراوە، دیارە ئەم ئەرکانەش ئەگەر بە وردی لێیان بڕوانین، دەبینین ئەدەبیاتی کرمانجی ژووروو هەر لەسەرەتای بوونییەوە تا سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەرەو هەمان ئەو ئەرکانە (ئایینی و نەتەوەیی و خستنەڕووی بیر و باوەڕ و وەسفی سروشت) براون کە لە زارەکانی تری کوردی بەدی یان دەکەین.

ئەوەی هەر لەسەرەتاوە سەرنج رادەکێشێ ئەوەیە کە ئەرکی ئایینی دیارترین ئەرکی شیعری سەربەم زارە بووە لە قۆناغی کلاسیکی دا.

دیارە ئەم ئەرکە لە شیعری زۆرینەی شاعیرەکانی کرمانجی ژووروو بەدەربڕینی بابەتی نزا و پارانەوە و ستایشی خوا و پێغەمبەر.. بینراوە: ((وەکو داب و نەریتێك، هەمی هۆزانڤانێن کلاسیکی ئەڤێت بابەتێن ئایینی دبەرهەمێن خۆدا بەحس کرین. ژ خودێ پەروەردگار و بێ هەڤال دپارێنە ڤە و داخازا لێبورین و بەخشینێ ژێ دکەن)).[2]

1- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی دووەم: ل ١٢ .

2- هۆزانا ئایینی د بەرهەمێ پەرتوپێ هەکاریدا، د. عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی، ئەکادیمی، کۆواری کۆری زانیاری کوردستان، ژ (٤)ی ٢٠٠٦: ل ١٥٥ .



بۆیە ئەگەر سەیرێکی غەزەلەکانی مەلای جەزیری بکەین کەلە روالەتدا ئەرکی دەربڕینی هەست و سۆزی دلداری پیشاندەدا، بەڵام کاتێك کەلێی ورد دەبینەوە، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا ئەرکی ئایینی و تەسەوفی پێ بینراوە: ((عیشقی مەلا بەهۆی جەزبی ئیلاهییەوە بووە و گرفتاری ئەوینێکی سۆفییانە هاتووە، لەشەرابی خۆشەویستی راستەقینە سەرخۆش بووە تا گەیشتۆتە ئەو پلەیە لە خۆشەویستی خواوەند))[1]، هەروەك لەو دەقەدا کەلە بارەی یەکانییەتی خوای مەزنە دەبینرێ:

**ایرۆ ژ رەمزا دیم دری منت مسرورە دل**
**دلبەر بە فنجانا سەری مە دا مەد مخمورە دل**
**اوستادی عشقی دل دشوت سەرتا قەدەم هنگی دشۆت**
**رەمزانا الحق هەردگوت باوەربکن منصورە دل**[2]

**(فەقێ تەیران) یش لەبارەی یەکانییەتی خوای ڕاستەقینە دەڵێ:**

**یارێ حەقیقەت خالقە**
**چوون جانفیدایێ ڤێکە ڤین**
**راست و دروست و صادقە**
**چ رەنگ ڤ شووناڕێ کەڤین**[3]

تەنانەت لە چیرۆکە شیعری (شێخی سەنعان)یشدا (فەقێ تەیران) ئەرکی ئایینی بەخستنە رووی خۆشەویستی مەجازی و کۆتایی هاتنی بەخۆشەویستی حەقیقی و باوەڕ هێنان بە ژیان و مردن و ژیانەوە بینیوە: ((لەم داستانەدا سەرکەوتن بۆ خواستی پاکی مرۆڤە، شێخی سەنعان وێنەی پاکی و خۆشەویستییە و سالانی خەڵوەت و عیبادەت، خۆشەویستی ئینسانی لەدەروونا بەهێز کردووە و ئەو خۆشەویستییەشی نەبەستووە بە شوێن و کاتەوە، ئەگەر لە شێوەی بێ

1- العقد الجوهري في شرح ديوان الشيخ الجزيرى، الجزء الاول، الطبعة الثانية، مطبعة الصباح ١٩٨٧: ل س

2- دیوانی شێخ ئەحمەدی جەزیری، چاپی یەکەمین، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، ١٩٦٤: ل ٩٥ .

3- دیوانا فەقێ تەیران، سەعید دێرەشی، چاپائێکێ، چاپخانا وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٥: ل ١٣٩ .

سنوور (مطلق)ی ئایدیالیستیش دا داینابێ، بناغەکە لای ئەو هەر سەرکەوتنی مرۆڤە و هەستی پاکییەتی و زاڵ بوونییەکێتی ئینسان و گیانی خوشەویستی و برایی یە)) [1]

**مەلەکی هادی ب خار هات**

**قیسسا مورشید ب کار هات**

**شێخ د دەستی شێخ عەتارهات**

**هەروەکی ژ کەعبێ قەتێ**

**دورِ ژ بەحرا نون و کافێ**

**شێخ ئانی کەشافێ**

**سۆفیان بەردان تەوافێ**

**خاچ حوبینێ دل کەتێ** [2]

(ئەحمەدی خانی)یش سەرەتای (مەم و زین)ە کەی بەسوود وەرگرتن لەسورەتی (الاخلاص) بەستایشی پەروەردگار دەست پێ دەکا و دەڵێ:

**ئەی واحدێ بێ شەریك و یەكتا — وەی واحدێ بێ نەزیرو هەمتا**

**ئەی باقی بێ بێ زەوال و دائم — وەی هادییێ بێ فەنایێ قائم** [3]

**(پرتەوی هەکاری) لەپارانەوەی لەپەروەردگاردا دەڵێ:**

**یارەب ژ غەیری شوك کینە بێ حەدو بێ حسێب**

**ئینایە پر تویی ب دەرێ (باب کبریا)**

**یارەب نەب ئەمرۆ ب نەصا کەلامێ تە**

**ت بخشی ژ غەیری شرك و گناهان و حرمها**

---

١- فەقێ تەیران ژیان و بەرهەمی، دکتۆر عیزەدین مستەفا رەسوول، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژ (١٥)، ١٩٧١ – ١٩٧٢: ل ٣٠ .

٢- شیعری کوردی ژیان و بەرهەمی شاعیرانی، بەشی یەکەم، د. عیزەدین مستەفا رەسوول، چ. الحوادث، بەغدا، ١٩٨٠ : ل ٣٦ .

٣- مەم و زین، ئەحمەدی خانی، ڤەژاندنا پەرویز جهانی، چاپا یەکێ، انتشارات صلاح الین ایوبی، ١٣٦٧: ل ٩ .



**ئینایە چ مەفعل و عەمەل جملە حاضرن**

**قەولێ کەریم لوطفێ ئیلاهـ بکە عەطا** [1]

ئەم هەستی ئایینییە لە شیعری شاعیرانی کرمانجی ژووروو سەرلە نوێ دەبووژێتەوە و بەردەوامی وەردەگرێت تا سەردەمی دەرچوونی رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان لەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و سەرەتاکانی سەدەی بیستەم، تەنانەت ئەو شیعرانەی کەلە رۆژنامە و گۆڤارەکانی ساڵی ١٨٩٨ بەولاوە (رۆژنامەی کوردستان، و گۆڤاری رۆژی کورد و هەتاوی کورد و.. هتد) بەشێکیان هەمان ئەرکی پێشوویان لەبزواندنی هەستی ئایینی و پیشاندانی موسلمانێتی شاعیر و میللەتی کوردیان پێ ئەنجامدراوە.

بۆنموونە لەگۆڤاری (هەتاوی کورد) [2] شیعرێکی مەلای جەزیری تیادا بڵاوکراوەتەوە کەلەباس و بۆنەی پێغەمبەردا هاتووە.

(عەبدولڕەحیمی رەحمی هەکاری)یش لە شانۆنامە شیعرییەکەی (مەمی ئالان)دا جەنگە ئایینییەکەی لە دژی سەلیبەکان بەخۆشەویستەکەی و هەروەها بەخۆشەویستی نیشتمان و بەرگری و سەربەخۆیی و رزگاری خوازی نەتەوەی کورد بەستۆتەوە:

**ایرو هفتە داوەت کری**

**غزایی از ژ تە کری**

**از دیبچمە بر کافری**

**غزالا من، دلالا من بس بگری**

**توبس روهنکان ببارینە**

**ایرو دوژمن لە کینە**

**وەستا نا مە لائق نینە**

**غزالا من، دلالا من بس بگری** [3]

---

١- هۆزانا ئایینی د بەرهەمی پەرتویێ هەکاریدا، د. عەبدوڵڵا یاسین ئامێدی، ئەکادیمی، کۆواری کۆری زانیاری کوردستان، ژ (٤) ی ٢٠٠٦: ل ١٥٥ .

٢- بڕوانە گۆڤاری هەتاوی کورد، ژ (٤ – ٥) ی ساڵی ١٩١٤: ل ١٢ – ١٣.

٣- گۆڤاری ژین، ژ (١٥): ل ٢٤ .

ئەرکێکی تری شیعر لە ئەدەبی کرمانجی ژووروودا ئەرکی نەتەوەیی و نیشتمانییە، هەروەك لای (ئەحمەدی خانی لەداستانی، مەم و زین)دا دەبینرێ کە تیایدا توانیویەتی چەندین ئەرکی (ئایینی و دلداری و بیروباوەڕ و نەتەوەیی و...) ئاوێتەی یەکتر بکات:

**شەرحا غەمێ دل بکەم فەسانە**
**زینێ ومەمێ بکەم بەهانە**[1]

بۆ ئەوەی نەیارانی کورد نەڵێن کورد لەبارەی عەشقی مەجازی و حەقیقی هیچ نازانن و هیچ داستانێکی دڵداریشیان نییە، خانی دەڵێ:

**هەم ئەهلی نەزەر نەبێن کو کورمانج**    **عێشقەك نەکرن ژ بۆ خوە ئامانج**[2]

هەروەها خانی بەداستانە شیعرییەکەی ئەرکی هۆکاری نەبوونی سەرکردەیەکی کوردی و نەبوونی رێك کەوتن و یەکیەتی رێزەکانی گەل وە دابەش بوونی میللەتی کورد لە نێوان خۆیاندا بەسەر چەند چینێك دەگەڕێنێتەوە بۆ نەبوونی دەولەتی کوردی:

**گەردێ هەبووایە مە ئیتفاقەك**    **ڤێکرا بکرا مە ئینقیادەك**
**لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن**    **دائم ب تەمەڕوودو شیقاقن**[3]

هەمان تێڕوانینی خانی لەبارەی ئەرکی نەتەوەیی لەشیعرەکانی (عەبدولڕەحیمی هەکاری) رەنگ دەداتەوە و تەنانەت پەنجەش لەسەر کێشە و گیروگرفتە سیاسی و نەتەوەییەکانی کورد دادەنێ و رێگای چارەسەریشیان پیشاندەدا:

**ئەی میللەتی صاحب نفاق**
**لازمە ژ بوتە ئیتفاق**
**تەئسیس نەکەن ئەم یەك ویفاق**
**مەحوینە بیلئتفاق**

١- مەم و زین، ئەحمەدی خانی، ڤەژاندنا پەرویز جهانی: ل ٤٣ .
٢- هـ. س : ل ٣٥ .
٣- مەم و زین، ئەحمەدی خانی، ڤەژاندنا پەرویز جهانی: ل ٣٣ .



**عەقلی خو بەرهوکەن هەمی**
**وەخت، زەمان پر نازیکە**
**بێ ئیتفاقی تە هلەکە**
**خەلقان هەمی دگەلە ریکە**
**مەحویتا مە بێ شکە**
**عەقلی خو بەرهوکەن هەمی**
**دەست دەنە یەك شبی برا**
**هەلکەن ژ بو خو یەك چرا**[1]

هەر لەم قۆناغەدا شیعری کوردی لە کرمانجی ژووروودا ئەرکی دەربڕینی جوانترین دەقی لەشانازی کردنی شاعیر بەزمانی شیعری خۆی، بینیوە:

**گەر لؤلوئی مە نثور ژ نظمی تو دخوازی**
**وەر شیعری مەلێ ببین تەبشیر از چە حاجەت**[2]

(فەقێ تەیران)یش لەم بارەیەوە دەڵێ:

میر محێ شاعرێ پاکە    هەر کەسێ رووح بوو ژ ماکە
هەمی یان دێ ئەو فەناکە    ئەوی شاهێ قودرەتێ[3]

ئەحمەدی خانی لە شانازی کردن بەتوانای خۆی لەبەرکارهێنانی چەندین زاری کوردی و زمانی تری بێجگە لەزمانی کوردی بۆ نووسینی داستانەکەی دەڵێ:

**کوردی، عەرەبی، دەری و تازی**    **تەرکیب کرن ب هەزل و بازی**[4]

١- گۆڤاری ژین، ژ (٥): ل ١٤ .
٢- دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری چاپی ئەکەمین، چ. هەولێر، هەولێر، ١٩٦٤: ل ٥٢ .
٣- دیوانا فەقێ تەیران: ل ٢٧ .
٤- مەم وزین: ل ٢٦٨ .

کەواتە ئەحمەدی خانی لەڕێگەی داستانی مەم و زین هەرچی بیروباوەر و هەست و سۆزی کەسی و نەتەوەیی هەیە هەمووی لەداستانەکەی دەربڕیوە، هەر لەبەر بایەخی زۆری ئەم داستانە دەبینین لە ژمارە (٢)ی ڕۆژنامەی کوردستان * و ژمارەکانی تری بەدواوە بەزنجیرە داستانەکە بلاوکراوەتەوە، دیارە کە ئەمەش لە ئاکامی هەست کردن بە لێپرسینەوە و بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوەیی و نیشتمانی سەرپەرشتکارانی ئەم ڕۆژنامە و هەموو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی ترە کە هەمان ئەو ئەرکانەیان چ بە شیعرەکانی خۆیان چ بەشیعری کەسانی تر بینیوە.

هەر لە روانگەی هەستی نەتەوەیی و دەربڕینی خۆشەویستی بۆ نیشتمان شیعرە ستایشەکان هەمان ئەرکیان پێ پینراوە، بەتایبەتی لە ستایشی میللەت و میرانی کورد.

مەلای جەزیری: ((ئالەو چەرخەدا ستایشی میرێکی کوردی کردووە و هیوای ئەوەی بووە کە دەسەلاتی ئەو میرە لەزیاد بوون بێت... ئەمە لەو چەرخەدا مەلای عاشقی سۆفی بەرەو هەندێ لایەنی نیشتمانپەروەری ئەبات)). [١]

**ئەی شەهەنشاهی معظم حق نگەهداری تەبێ**
**سورەی انافتحنا حافظ و یاری تەبی** [٢]

خانی لەستایشی میرەکانی کورد و وەسفی ئازایەتییان دا دەڵێ:

**هەرمیرەکێ وان ببەزل حاتەم**
**هەر میرەکێ وان ب رەزمێ روستەم**
**ئەڤ غێیرەت و ئەڤ علوڤێ هێممەت**
**بوومانعێ حەمل بارێ مننەت** [٣]

* بروانە ژمارە (٢، ٥، ٦، ٧، ٨،...) ڕۆژنامەی کوردستان ١٨٩٨-١٩٠٢، کۆکردنەوە و پێشەکی د.کەمال فۆاد، چاپی دووەم، چاپ: دەزگای روز الیوسف، قاهیرە، ٢٠٠٥ .

١- مەلای جەزیری و شتێك دەربارەی ژیان وبەرهەمی دکتور عیزەدین مستەفا رەسوول، چ (دار الحکمە) هەولێر، ١٩٩٠: ل ٣٣ .

٢- دیوانی شیخ ئەحمەدی جەزیری چاپی یەکەم: ل ١٢٨ .

٣- مەم و زین، ئەحمەدی خانی، ڤەژاندنا پەرویز جهانی: ل٣٢ -٣٣ .



لەستایش کردنی میللەتی کوردیش دەڵێ:

**جامێرێ و هیممەت و سەخاوەت — مێرینی و غیرەت و جەلادەت**
**ئەو خەتمە ژ بۆ قەبیلی ئەکراد — وان دانە ب شویر و هیممەتێ داد** [١]

لەستایش کردنی (شەریف پاشا) عەبدولڕەحیم هەکاری دەڵێ:

**دی سا ژێ شەجاعەتاتە ای خان**
**دەریەك وەبویە ژێ بومە کوردان**
**پشتا تەیە حوم لەکورد، کرمانج**
**لەورا کوتە حەق کێ ری یە ئارمانج** [٢]

هەر لەزاری کرمانجی ژووروودا شیعر ئەرکی خۆڕاگری و ئازایەتی و چاونەترسی بەرامبەر بەدیوەخانی پاشاکان کە بەچاوێکی کەم سەیری شیعری شاعیرانی کوردیان کردووە بینیوە: ((... لەهۆنراوەی (ناچم دیوانێ)ی ئەم دیوانەدا دەنگی شاعیر خۆی ئەو دەنگە دلێرەی ئادەمیزادە. مەسەلەی مرۆڤ لێرەدا زۆر بە ڕۆشنی دیارە. بیری وردی فەقێی تەیران و بەڕاستی لە رووداوی مێژوو گەیشتن دیمەنی ئەم هۆنراوەیەیە. فەقێی تەیران لێرەدا بەشاعیرێکی پێشکەوتن خواز کە چەند سەدە لەمەوبەر لەگەڵ ڕێڕەوی مێژوودا وەستاوە خۆی دەنوێنێ، هاواری مردنی کۆنە و چەوساندنەوەی کردووە و بانگی سەرکەوتنی تازە و مەردایەتی کردووە.)) [٣]

**ئەز ناچم دیوانێ میرا**
**نابم شارووری کۆچك و سەرا**
**برامن خەن کێر و خەنجەرا**
**فەقێ یێ تەیرا تەنگە زارێ دلا**

١- هـ. س : ل ٣٣ .

٢- گۆڤاری ژین، ژمارە (٢١): ل ١٥ — ١٦ .

٣- فەقێ تەیران ژیان و بەرهەمی، دکتور عیزەدین مستەفا رەسوول، گۆڤاری کولیجی ئەدەبیات ژ(١٥)ی ١٩٧١ -١٩٧٢: ل ٣٤ — ٣٥ .

**گوشتی من راکەن ب ماشا**
**ل من خەن تیر و کەڤانا**
**ناچم دیوانێ میر و حاکما** [1]

دیارە هۆکاری دوورە پەرێزی فەقێ تەیران لەدیوەخانەکان لەبەر خراپـەکاری و زۆرداری مـیر و نەوەکانیان بەرامبەر بەمیللەت بووە، شاعیر دەڵێ:

**کورنێت میر پر خەدارن**
**زندان بۆ نا نەفسی ژارن**
**ئەزمرێ ناکەم فگار**
**ئازایی بێ دخازم هەرجار**[2]

هەروەها شیعری ئەم قۆناغە ئەرکی کۆمەڵایەتی بینیوە بەدەربڕینی ئامۆژگاری و هانـدانی رۆڵـەکانی کورد بۆ خۆشەویستی نیشتمان و خزمەت نەکردنی نەیارانی کورد، فەقێ تەیران لەم بارەیەوە دەڵێ:

**گوهـ بدەنە پیرێ دەفتەران**
**دائەز بخونم ڤێ خەتێ**
**مازن ببی باخو مەدا**
**ل جوندیێ دخزمەتێ**
**خزمەتا سولتان و میران**
**صنعەتا داو وەزیران**
**هون مەکەن بێ شێخ و پیران**
**گوهـ بدەن ڤێ شیرەتێ** [3]

١- شیعری کوردی، ژیان و بەرهەمی شاعیرانی، بەشی یەکەم، د. عیزەدین مستەفا رەسوول، چ (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٠ : ل ٤٠ .
٢- سەرچاوەی پێشوو : ل ٤٢ .
٣- هوزانڤانێت کورد، دانان و توێژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی، چاپا یەکێ، چ. کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٠: ل ٢١٦ .



ئەم دیاردەی ئامۆژگارییە لای (رەحمی هەکاری) لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا بەمەبەستی هاندانی کوڕەکەی بۆ خۆشەویستی وڵات و ئاوەدان کردنەوەی رەنگ پێ دەدرێتەوە:

سعدو:
**چی تو بچووکی ناتوانی**
**لاکن سبەهی تو قەهرەمانی**
**ئەز دێ بمرم بچم ژ دنیا**
**لازم وەتەنی بکەی تۆ ئەحیا**[1]

بە مەبەستی ئامۆژگاری و هاندان بۆ خوێندن و کردنەوەی قوتابخانە و هاندان بۆ کـارکردن و دوورکەوتنەوە لە تەمبەڵی و بەستنەوەی بە ئەرکی ئایینی و نیشتمانی (کردی زادە،ع. ثـابـت) لەدەقێکی شیعریدا دەڵێ:

**هەر رۆژ هەر شەڤ بخەبتین**
**مەکتەب ڤەکەن، تەحصیل بکەن**
**غیرەت بکەن هون خورت بن**
**تاقا خودا بیرامەکەن**
.................................
**گەلێ کوردا شۆرەك دەکەم**
**هەموو کرمانج دەستەك بن**
**بونامە مەکتەب لازمی**
**بونامە صەنعەت لازمی** [2]

هەر لەڕوانگەی ئەرکی کۆمەڵایـەتی شـیعر لـەم قۆناغـەدا بابـەتی بایەخدان بـە زانسـت و زانیاری و ئامۆژگاری کردن بەدوورکەوتنەوە لەهەندێ داب و نەریتی خراپ لـە شـیعری (حلمـی سیوەرکی) رەنگی پێدراوەتەوە:

١- گۆڤاری ژین، ژمارە (٨): ل ١٥ — ١٦ .
٢- گۆڤاری ژین، ژ (١٢): ل ١٦ .

ئەم ئەولادە حەمو کوردان
ئەم دخازین عیلم و عرفان
دەرس و راستی مە هەڤالە
شورو قەلەم مە هەم حالە [1]

شیعری کرمانجی ژووروو ئەرکی پەروەردە و فێرکردنی منداڵانی کوردی بەمەبەستی فێربوونی زمانی بیانی و تێگەیشتن و شارەزا بوون لە وشە و فەرهەنگی ئەو زمانانەی کە میللەتی کورد ئاشنایەتییان لەگەلیان، پێ بینراوە.

دیارە لەم بوارەشدا (ئەحمەدی خانی) باڵا دەست بووە بۆ خزمەتکردن و پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە و فێرکردنی منداڵانی کورد لە وشە و زاراوەی عەرەبی بۆ ئەوەی باشتر ئاشنای قورئانی پیرۆز بن:

ڤێك ئێ خستن ئەحمەدی خانی
ناڤ لێ نوبارا بچوکان دانی
نەژبۆصاحب رەواجان
بەلکی ژبۆ بچوکێت کرمانجان
وەکی ژ قورئانی خلاس بن
لازمە لسەوادی چاڤ ناس بن
لوان تەبیعەت مەلەکان
دەرێ زهنێ ڤە بتن
هەرچی بخونن زەحمەتێ نەبتن [2]

خانی وشیارانە لە (نوبهارا بچوکان)ەکەیدا زاراوەی عەرەبی بەرامبەر بە زاراوەی کوردی وەکو فەرهەنگێکی سەردەمانە داناوە:

١- گۆڤاری ژین، ژ (٢٥): ل ٢٣ — ٢٤ .

٢- نوبهارا بچوکان، تأليف الاديب والشاعر الكردي احمد خاني، حمدي عبدالمجيد السلفي، الطبعة الاولى، مطبعة الرشيد، بغداد، ١٩٩٠: ل ١١.



(ابن) کورو (بنت)ە کەچ
(صِهر)ە خەزورو مامە (عم)
(عمة) مەتە (عِمامة) شاش
(جدة) چیە خو پیرەدا [1]

دیارە لەپاڵ ئەو ئەرکانەدا کە شیعری سەربەم زارە بینیویەتی ئەرکی جوانکاریش بەردەوام رۆڵی خۆی بینیوە لەبەرهەم هێنانی دەقەکاندا، ئەویش بەپەنابردنە بەر هونەرەکانی رەوانبێژی و داڕشتنی هونەری دەقەکان.

## پ – ئەرکی شیعر لە زاری کرمانجی خوارووودا:

پەیدابوون و سەرهەڵدانی ئەدەبی کوردی لە زاری کرمانجی خوارووودا وەکو بزووتنەوە و قوتابخانەیەکی ئەدەبی خاوەن دەستوور و بنەما و رێ و شوێن و بەهەستکردن بەو بارودۆخ و زەمینە لەبارەی کەلەژیان و ئەدەبیاتی نەتەوە دراوسێ یەکاندا (ئەدەبیاتی رۆژهەلاتی ئیسلامی) هەبووە لەسەردەمی بابانییەکاندا سەری هەڵداوە، کەلە چوارچێوەی ئەو دەستوور و بنەما ئەدەبییانەی رۆژهەلاتی ئیسلامیدا وە بەسوود وەرگرتن لێیان، بەڵام بە بایەخدان و پاراستنی تایبەتمەندی و رەسەنێتی نەتەوە و زمانی کوردی دا لە ئارادا بووە.

بۆیە ئاشکرایەکەباس لەشیعری کرمانجی خوارووو بکرێ باس لە (نالی و سالم و کوردی) وەکو قوتابخانەیەك دەکرێ. ئەگەر سەیرێکی شیعرەکانیان بکەین و لێکیان بدەینەوە، دەبینین شیعر لەلایان بەرەو ئەو ئەرکانە براوە کەلە شیعری میللەتانی دراوسێ (فارسی و عەرەبی و تورکی) دەبینرێ دیارە هەمان ئەو ئەرکانەی کەلە ئەدەبیاتی رۆژهەلاتی ئیسلامیدا هەبووە لەرێگەی بابەتەکانی وەك: (ستایش، داشۆرین، شانازی و دڵداری و وەسف) لەناو شیعری کرمانجی خوارووشدا بەرچاو دەکەوێ.

١- سەرچاوەی پێشوو: ل ١٨ .

بەم پێیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە رەخنەی کوردیمان لەو قۆناغەدا راستەوخۆ داوای لەشاعیران کردووە کە مرۆڤێکی (پەیامدار) بن و بەرهەمەکانیشیان بەو شێوەیە بنیات بنێن کەلە خزمەتی کۆمەڵ و نەتەوەکەیان و هەموو مرۆڤایەتیشدا بێت.

دیاریشە لەپاڵ ئەو داوای ئەرك بەخشینە بەشیعر ئەوەشیان فەرامۆش نەکردووە کەشیعر بۆ خۆی هونەرە و نابێ لایەنی هونەری و جوانکاری تیادا لەدەست بدرێ...



## باسی دووەم

## ئەرکی شیعر لە دەقی شیعری قۆناغەکەدا

ئاشکرایە کەلەسەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەتایبەتی لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی بەولاوە، میللەتانی جیهان بەگشتی و کورد بەتایبەتی لە بارودۆخێکی ئالۆز و نالەباردا دەژیان، دیارە ئەمەش بەهۆی ئەو وەزعە نێگەتیفە بوو کە لە ئاکامی جەنگە جیهانییەکەوە جێ مابوو.

شاعیرانی کوردیش وەکو هاوولاتی و خەمخۆری راستەقینەی نەتەوە و ولاتەکەیان روویان لەو بارودۆخە نائارامە کردووە و بەشدارییەکی چالاکانەی بارودۆخەکەیان دەکرد و بەشیعرەکانیان رەنگی ئەو تاڵییەی ژیانی میللەتان و میللەتی کوردیان دەدایەوە و شیعرەکانی ئەوقۆناغەش زیاتر لە رۆژنامەی (بانگی کوردستان، رۆژی کوردستان، ئومێدی ئیستقلال و ژیانەوە و ژیان و...) و گۆڤاری (هاوار، رووناکی، گەلاوێژ، نیشتمان...)دا بلاودەکردەوە، دیارە ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەش کە سەرچاوەی سەرەکی و بایەخداری راگەیاندنی ئەو سالانە بوون و رۆڵی زۆریان لە وشیارکردنەوەی میللەتدا بینیوە.

هەر بۆیە ئەو شیعرانەی کەلەسەر لاپەڕەی ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەدا بلاو دەکرانەوە بەتایبەتی لەو قۆناغەدا زیاتر ئەرکی وشیاری سیاسی و خۆشەویستی نیشتمان و هاندان و وروژاندنی هەستی نەتەوەیی و وریاکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵك لەپێویستییەکانی بارودۆخەکە و ئاکامەکانی ئەو پێویستییانە و کاریگەرییان لە پێشکەوتنی سەردەمەکەو ژیانی میللەتی کوردیان پێ بینراوە.

هەرلەم قۆناغەدا شاعیرانی کورد پەیامدارانە و وشیارانە روویان لە چەند بابەتێکی شیعری کردووە تا ئەرکێکی دیاری کراویان پێ ببینن وەك ئەرکی سیاسی و نیشتمانی و کۆمەڵایەتی و ئایینی و... هتد، دیارە شاعیرانمان هەرزوو ئەو راستییەیان لا روون بووە کە: ((هەستیاری پەیامدار نابێ خۆی لە زەلکاوی بارێکی دواکوتوودا نقوم بکات و بەگوێرەی قۆناغێکی کاتی خەلکی ولات هۆنراوە بنووسێتەوە و بۆ چەپلە و هەلپەرکێی و شایی خواپێداوەکان تەلی هونەری بخاتە کار. بەلکو پێویستە لەڕادەی هونەری ی هۆنراوەی رەسەن تۆسقالێك نەیەتە خوارەوە و، خەلکی ولات بە ناوەڕۆکی بیرو باوەڕی و رووخساری هونەری رابەری بکات و ئێش

و ئازار و ئاواتیان بکا به سەرچاوەی خورپە و ئیلهامی دەربارەی دوارۆژیان چاو ببڕێتە ئاسۆی واقیع و پێشەوایی یان بکات)).[1]

هەروەها لەو قۆناغەی ژیانی کورددا شیعر ئەرکی ئامۆژگاری و بانگەشەکردنی میللەت لە پێویستی بایەخدانیان بەخوێندن و فێربوونی زانست و زانیاری بۆ لەناوبردنی هۆکارەکانی دواکەوتنی میللەت لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، پێ بینراوە: ((شاعیران هەریەکەیان بەجۆرێك گوزارشتی لەوبارە نائاساییە دەکرد، بابەتەکانیشیان بەزۆری بریتی بوون لە هاندان و هوشیار کردنەوەی خەلك لەبەردەم پێشهات و رووداوەکاندا، داواکردنی گەڕان بەدوای زانست و خوێندەواری و پەیوەست کردنی زانست و سیاسەت بەیەکتری، باس کردن لە هەژاری و بێ کەسی کورد و دەربڕینی ئازار و مەینەتییەکانی... کارکردن لەپێناو بەجێ گەیاندنی ئاواتەکانی میللەتی کورد و بەدەست هێنانی سەربەخۆیی، دەربڕینی خۆشەویستی بۆ نیشتمان... باسکردن لە ئازایەتی کچ و ئافرەتان و وەستان دژی هەندێ دابی کۆمەلایەتی))[2]، دیارە لەناو ئەو ئەرکانەدا ئەرکی سیاسی و نیشتمانی دیارترین ئەرکی شیعری قۆناغەکە بوون.

ئەم دوو بابەتە شیعرییەش پەیوەست بوون بەیەکترەوە و: ((نیشتمان پەروەری وەك ئەلقەیەکی گرنگی هۆنراوەی کوردی هەر لەقۆناغی کلاسیکییەوە تا سەرجەم قۆناغەکانی تر رەنگی داوەتەوە، بەگوێرەی بارودۆخی ئەو سەردەمەی شاعیریشی تێدا ژیاوە، ئەم ئەلقەی هۆنراوەیە گۆڕانی بەسەردا هاتووە، بوارەکەی تەسك یا فراوان بۆتەوە، ئەوەی جێگەی سەرنجیشە ئەوەیە کە رەگەزەکانی هۆنراوەی نیشتمان پەروەری و سیاسی و بەرگری لای شاعیرانی کورد هێندە چوونەتە ناویەك و سیمای یەکتریان لەژێر پەردەی گشتییەکەی نیشتمان پەروەریدا شاردۆتەوە، کە ئەم دوو جۆرەی دوایتر هەرلەسەر بنچینە پتەوەکەی خۆشەویستی خاکی نیشتمان و ئەو پەیوەندییە بەتینەی بەیەکیان دەبەستێتەوە لەدایك دەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هێلی جیاکردنەوەی ئەم جۆرانە لە هۆنراوەی کوردیدا بەڕاشکاوی دەردەکەوێت)).[3] کەوابێ ئێمەش لێرەدا بۆ ئەوەی زیاترو باشتر تیشك بخەینە سەر ئەرکی ئەم بابەتە شیعرییانە، وای بەباش و پێویست دەزانین کە هەریەکەیان بە جیاجیا و سەربەخۆ باسیان لێوە بکەین.

---

١- وێژەی کوردی و رەخنە سازی: ل ٢٢٠ .

٢- سیماکانی تازەکردنەوەی شیعری کوردی (١٨٩٨ — ١٩٣٢)، یادگار رەسوول بالەکی، چ. وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٥: ل ١٦٠ — ٢٥٩ .

٣- کامەران موکری، ژیان و بەرهەمی، پەخشان سابیر حەمەد، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٣: ل ٣٧ .



### ١- ئەرکی سیاسی شیعر:

مەبەست لە شیعری سیاسی ئەو شیعرەیە کە ئەرکی دەربڕینی ئەو بیر و باوەڕانەی پێ بینراوە کەپەیوەندییان بە حوکم و دەسەلات و سیستەمی بەڕێوەبردنی کۆمەڵ و ولاتەوە هەیە و هەروەها باس کردن لە قەوارەیەکی سیاسی ولات و خۆشەویستی نەتەوە دەگرێتە خۆی.

دیارە ئەم هەست و دەربڕینانەش رەگێکی قوولیان هەیە و بۆ سەردەمێکی کۆنی مێژووی ئەدەبیاتی کوردی دەگەڕێنەوە (بەلام دیارە دەربڕین لەو کێشە و گیروگرفتانە بەشێوەیەکی ساکارانە بووە)، ئەو سەردەم و کاتانەی کەتیایدا شاعیران لەدەوروپشت و دراوسێکانیان روانیوە و دەرکیان بەو راستییەش کردووە کە هەر نەتەوەیەك خاوەن ولات و قەوارەی سیاسی سەربەخۆی خۆیەتی و بینیویانە کە هەر نەتەوەی کوردە بەدەست داگیرکەر و نەیارانی کورد دەنالێنن و دەچەوسێنرێنەوە لەگەڵ بوونی هەموو ئەو مەرجانەی کە بۆ بوونی دەولەت پێویستە لە (خاك، زمانی سەربەخۆ، نەتەوە، ئایین...) (عەبدوللا ئاگرین) لەم بارەیەوە دەلێ: ((... لەبەر ئەوەی کورد تا ئێستا خاوەنی قەوارەیەکی سەربەخۆی بۆ خۆی دابین نەکردووە.. شیعرە سیاسیەکەشی رەنگدانەوەی ئەو واقیعە تالەیەتی و هانی رۆلانی ئەدا کۆشش و خەبات لەپێناو دامەزراندنی قەوارەیەکی سیاسی سەربەخۆ لەکوردستاندا بکەن. بەپێی ویست و بەرژەوەندی بەرز و گشتی گەلی کوردستان و بەڕێوەبردنی دەسەلاتی حوکم و حکوومەت دیاری بکەن))[1]

کەواتە بە بۆچوونی (عەبدوللا ئاگرین) شیعری سیاسی کوردی لە ئاکامی نەبوونی دەولەتی کوردی و قەوارەیەکی سیاسی کوردی سەری هەڵداوە.

وەك ئاشکرایە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بەگشتی و سالانی جەنگی یەکەمی جیهانی بەتایبەتی بۆ خۆیان بارودۆخێکی نوێیان لەجیهان و لە کوردستانیشدا خولقاند و لەڕووی سیاسییەوە زەمینەی ئالوگۆڕێکی گەورەیان پێك هێنا هەر بۆیە بابەتی سیاسیش راستەوخۆ و بەشێوازێکی نوێ و سەردەمییانە چووە ناو تاقیکردنەوەی شیعرییەوە پێش هەموو شتێك نابێ ئەو راستییانە فەرامۆش کەین کە کاتێك ئاگری جەنگی جیهانی کوژایەوە ئاکامەکەی بووە هۆی ئەوەی کە بەسەدان مال و لانەی وێران کراو و بەهەزاران منالی بێ دایك و باوك و ژنی بێ مێرد و برا جێ هێشت.

---

١- شیعری سیاسی کوردی لە کرمانجی خواروودا (١٩١٨ — ١٩٣٠)، عەبدوللا ئاگرین، نامەی ماستەر زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٤: ل ٤٥ .

پاشماوەی خراپی و کاولی بەجێماوی شەڕ وایکرد کە شارستانێتی چەندین ساڵی دامەزراو لەچەندین ولاتدا برووخێت و لەناوچێت. ئەمە سەرەرای ئەو گرانییە ئابوورییەی کەڕووی لە زۆر لە وڵاتانی جیهان کرد و چەندین وڵات و نەتەوەش کەوتنە ژێر دەسەڵاتی داگیرکەران و دەچەوسێنرانەوە...

هەمووومان دەزانین کە کوردستان خاکێکی بەپیت و ستراتیجی هەیە، بۆیە هەر زوو خاکی کوردستان و نەتەوەی کوردیش پریشکی ئاگری ئەم شەڕەی بەرکەوت و زەرەر و زیانێکی زۆریشی لی درا و بووە شوێنی چاولەسەری شەڕکەران و دابەشکردن و ململانێی ولاتە سەرکەوتووەکانی شەڕ.

میللەتی کورد لەگەل ئەو هەموو دەردەسەرییەش بەتێڕوانینێکی گەشبینانە و پڕ لەهیوا و ئومێد بۆ دوارۆژی نەتەوەکەیان دەیانڕوانییە ژیان، چونکە ئومێدێکی زۆریان بەو پەیمان و بەڵێنانە هەبوو کە لەکاتی جەنگ و دوای کۆتایی جەنگیش کە وڵاتە سەرکەوتووەکانی جەنگ بڕیار و پەیمانیان پێ بەگەلانی جیهانی ژێرەدەستە و زۆر لێکراوان دابوو، دیارە دڵیشیان بەو بەڵێنانە خۆش بوو، هیوایان سەربەخۆیی و ئازادی و دامەزراندنی دەولەتی کوردی لە کوردستانێکی یەك پارچەی یەکگرتوویان دەخواست: ((سەرکردە و کەسایەتییە ناودارەکانی کورد ئارەزووی ئازادی و سەربەخۆییان هەبوو، هەندێکیان ئەم ئارەزوانەیان بەلێپرسراوانی بەریتانیا راگەیاند، ئەمەش لەکاتێکا بوو کەهێزە ململانێکەرەکان هەولی سەرنج و ئارەزووی کوردییان بۆ لای خۆیان رادەکێشا، لەڕێگەی بەڵێن دان بەدانانان بە مافەنەتەوەییەکان و لایەنگیری کردنیان...)) [1]

ئەگەر چی هەندێك لەو پەیمان و بەڵێنانە بەرژەوەندی نەتەوەیی و سیاسی کوردییان تیابوو، بەلام هەندێکیشیان لەدژی بەرژەوەندی سیاسی میللەتی کورددا داڕێژرابوون: {(پەیمانی سایکس بیکو)ی ساڵی ١٩١٦ کە لەنێوان ئینگلیز و فەڕەنسا بەسترابوو، هەروها کۆنگرەی ئاشتی (١٩١٩ — ١٩٢٠) کە زیاتر لە ساڵێکی خایاند و نوێنەری کورد لەم کۆنگرەیە (شەریف پاشا) بوو، (پەیمانی سیڤەر)ی ساڵی ١٩٢٠ کەلە شاری (سیڤەر) لە فەڕەنسا لەنێوان

١- كردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤ — ١٩٢٦)، سروة اسعد صابر، رسالة ماجستير، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٩ : ص ٤١.



ئینگلتەرا و فەڕەنسا و ئیتالیا و...لەلایەك و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیش لە لایەکی تر، ئینجا بەستنی (پەیمانی لوزان) ساڵی (١٩٢٣) و دانانی لە شوێن پەیمانی (سیڤەر) } . [1]

ئەمانە و چەندین بەڵێن و پەیمانی تر کە هەر هەموویان فرت و فێڵی داگیرکەران بوون، بەرژەوەندی ئەوانی تیابوو لە داگیرکردن و بەتالانبردنی سەروسامانی نەتەوەی کورد: ((هەر لەهەمان رۆژی بەستنی پەیمانی سیڤەر، بەریتانیا و فەڕەنسا و ئیتالیا پێکهاتنێکی سێ قۆڵی تایبەتیان لەنێوان خۆیاندا بەست کە تیایدا بڕیاری دابەشکردنی ناوچەکانی کوردستانیان دابوو)). [2]

دامەزراندنی حکوومەتی کوردی و بەدەست هێنانی مافەکانی گەلی کورد هیچیان سەری نەگرت و بەلێن و پەیمانی تورك بەچاکسازی و دان بەمافی رەوای کورد نەگەیشتە سەر و تورکەکان لێی پەشیمان بوونەوە، هەروەها پاشگەزبوون و نەهێنانەدی ئینگلیز لەو بەڵێن و پەیمانانەی کە بەکوردیان دابوو، سەرەڕای ئەمانەش دابەشکردنی کوردستان لەلایەن داگیرکەران و دەست بەسەراگرتنی خاکی کوردستان و خراپی و پاشکەوتنی باری ئابووری و کۆمەڵایەتی نەتەوەی کورد، سەرباری هەموو ئەمانەش دامرکاندنی شۆڕشەکانی کورد لە دوای کۆتایی هاتنی جەنگی جیهانییەکەم بارودۆخەکەیان زیاتر ئاڵۆز کردبوو.

ئەمانە هەموویان بوونە هۆی ئەوەی کە شاعیرانی کورد بەچاوێکی تر لەوەزعی کورد بڕوانن و بەپێی پێویستی بارودۆخەکە ئەم کێشانە لە شیعرەکانیان دا رەنگ پێ بدەنەوە و ئەرکی دەربڕینی ئەم کێشە سیاسی و نەتەوەییانەی کوردی پێ ببینن: ((شاعیرانی کورد تا رادەیەك وەزعی کورد و ئامانجی نەتەوەکەیان لە شیعرا دەربڕیبوو، بەمە کارێکی گەورەیان کردبووە سەر مشت و ماڵ کردنی بیروباوەڕی کوردایەتی و رێگای ئازادی و سەربەستی و ژینی بەختیارییان بەگەل پیشاندابوو.. ئەوەی کە گومانیشی تێدا نییە ئەوەیە کە کۆششی ئەم شاعیرانە بۆ مەبەسێك بوو، کە دامەزراندنی وڵاتێکی قەومی بووە بۆ کورد.. شیعری سیاسی کوردی تاقی کردنەوەیەکی تازەی ئەم رێرەوە بوو کە لەگەڵ بیر و باوەڕی ئەو قۆناغەدا دەگونجا)) [3] .

١- كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، تأليف كمال مظهر احمد، ترجمة محمد الملا عبدالكريم، الطبعة الثانية، دار آفاق عربية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٨٤ : ص ٣٠٦ — ٣٢٨ — ٣٤٤ — ٣٥١ .

٢- هـ. س: ل ٣٤٨.

٣- شیعری سیاسی کوردی لە کوردستانی عیراق، ماوەی نێوان هەردوو جەنگی گێتی، دکتۆر مارف خەزنەدار گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژ (١٥)، ١٩٧١ — ١٩٧٢ : ل ٤٦ — ٤٧ .

شاعیرانی کورد کەلەو بارودۆخە ئالۆز و نالەبارە سیاسی و کۆمەڵایەتییەی وڵاتەکەیان دا ژیاون بەشیعرەکانیان ئەرکی خستنەڕووی ئەو واقیعە تاڵەی ژیانیان رەنگ پێ داوەتەوە و بەشیعرەکانیان ئەرك و هەوڵی هاندان و وشیارکردنەوەی جەماوەری کورد و لایەنگیری خۆیان بۆ سەرکردەو شۆڕشگێڕەکانی کوردیان پیشانداوە چونکە: ((شیعر بەگشتی و شاعیری خەباتکەرو شۆڕشگێڕ بەتایبەتی ناتوانێ لە دەرەوەی بازنەی ئەم بارودۆخە بێ هەڵوێست بمێنێتەوە)). [1]

(شێخ نووری شێخ سالح) لەهاندانی جەماوەری کورد بۆ یەکگرتن و برایەتی و تەبایی دەڵێ:

**ئیتر وەرن کەبۆ وەتەن، وەتەن پاکو میهرەبان**
**دەس دەینە دەستی یەکتری یەك دڵ بەیەك زوبان** [2]

شاعیرانی کورد لەو قۆناغەدا داوای هەڵوێست لە میللەت دەکەن و تەنانەت لە نێوان خۆشیاندا رەخنە لە بەرهەمی یەکتر دەگرن و یەکتر وشیار و ئاگادار دەکەنەوە بەوەی کە قۆناغی ژیانی نەتەوەی کورد وا پێویست دەکا کە چیتر باس لەیار و شیعری دڵداری نەکەن و لەمەولا دەبێت شیعرەکانیان ئەرکی وشیارکردنەوە و وروژاندنی میللەت و رێگە پێشاندانی خەبات و قوربانی دان لە پێناو نیشتمان بۆ بەدیهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوەی کورد ببینێ، دیارە ئەم ئەرکانەش دەبێت لەپاڵ بەشداری کردنی شاعیران خۆیان لەتەك میللەتدا ئەنجام بدرێت:

**بەسیەتی ئەی شاعیران تەعریفی خەت و چاهی زەقەن**
**بەسیە ئەی مەئمور، ئیتر باسی معاشم بۆ مەکەن**
**بۆ وەتەن بۆ دین و میللەت بێن نەصیحەت دابدەن**
**بۆ تەرەقی میللەت ئێوە با بکەن صەرفی بەدەن**
**رۆژی سەعی و غیرەتە هەنگامی کەیف و شادی یە**
**جەژنی ئیستیقلالە ئەمجا نۆبەتی ئازادی یە** [3]

١- رێبازی شیعری کاکەی فەللاح، فەرهاد قادر کەریم، نامەی ماجستێر، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٦: ل ٥٣ .
٢- ڕ. رۆژی کوردستان، ژ (٥)، س١، ١٩٢٢: ل ٣ .
٣- ڕ. رۆژی کوردستان، م. نوری عەلی کەمال، ژ (٩) س ١ ١٩٢٣: ل ٢ .



(ئەحمەد موختار جاف)یش کاتێك کە سۆزی خۆشەویستی بەرامبەر بە نیشتمانەکەی دەجووڵێ، وا هەست دەکا کە کاتی ئەوە هاتووە پشت لە شیعری دڵداری بکا و بە شیعرەکانی رووکاتە خزمەتکردنی نەتەوە و نیشتمانەکەی و بەرگری لێ بکات لە پیلانەکانی دوژمنانی چاو برسی:

**لادە عاشق تۆ لە باسی عەشقبازی و سەیریکە**
**چۆن خەریکن چەند کەسێ ئێستا وەتەن وێران ئەکەن** [1]

هەروەها شیعری سیاسی لەو قۆناغەدا ئەرکەکانی لە خستنەڕووی هۆکاری نەبوونی دەوڵەتی کوردی و هاندان و وشیار کردنەوەی میللەت لە پشتگیری و بەشداری شۆڕش و راپەرینەکانی کورد و هەندێ جاریش لەباسی بۆنە و یادە سیاسییەکان بینیوە.

سەرکردەی قارەمانی کورد (شێخ مەحموود)ی نەمر لە ئاکامی کۆڵنەدانی لە شۆڕش و راپەرینەکانی دژی داگیرکەران و پێداگرتنی لەسەر داوای مافی رەوای کورد لە سەربەخۆیی و دامەزراندنی حکوومەتی کوردی دوژمنی ناچار کرد بەرازی بوون بەدامەزراندنی ئەو حکوومەتە: ((لەرێکەوتی ١٠ / ١١ / ١٩٢٢ حکوومەتی بەریتانیا و عیراقیش بە بەیانێکی فەرمی دانیان بە حکوومەتی کوردی نا)) [2].

بەدیهێنانی ئەم ئاواتەی گەلی کورد هەر چەندە زۆریشی نەخایاند بەڵام بوونی حکوومەتی کوردی دڵخۆشکەر بوو بۆ هەموو کوردێکی دڵسۆز و نیشتمان پەروەر، ئەم بارودۆخانە بە هەموو شێوەیەکی خۆش و ناخۆشییەوە شاعیرانی کوردی جولاندووە و توانییان هەڵوێستیان لێ وەربگرن و لە شیعرەکانیان رەنگی پێ بدەنەوە.

بەڕای (شێخ مەحموود) خۆی هۆکاری سەرنەکەوتنی دۆزە سیاسییەکەی گەلی کورد لە نەزانین و نەبوونییەکیەتی لەنێو میللەتی کورددا دەبینێ:

**موودەتێ عومرم بەتاڵان چوو لەسووچ و قوژبنا**
**پێمە لەم زۆر کرد لەبەر ئیمان لەبەحری بێ بنا**

١- دیوانی ئەحمەد موختار جاف، چاپی دووەمین، چ. هەولێر، هەولێر ١٩٦٩: ل ٦٥ .
٢- كردستان والحركة القومية الكردية، جلال طالباني، الطبعة الثانية، دار الطليعة، بيروت، ١٩٧١ : ل ٢١٧.

شەهبازێ بووم لە مەیدانی شکاری دوژمنا
چەهلی میللەت بوو بەزیللەت هات بەسەر شانی منا
سەیری جێگە زەخمی پەنجەم کەن بەدایم شاهیدە [1]

هەروەها بە بۆچوونی (شێخ) بێ ئاگایی و کەمتەرخەمی پیاوە ناودار و دەسەلاتدارەکانی کورد هۆکارێکی تری لە دەست دانی ئەم هەلە بوو، بۆیە لە داواکردنی وریایی لە میللەت و ئاگادار کردنەوەی میللەت لەوەی کە نابێت بۆ بەدەست هێنانی مافەکانیان پشت بە دوژمنان ببەستن و بڕوایان پێ بکەن بەڵکو دەبێ میللەت بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانیان دەبێت تێبکۆشن و پشت بەیەکتری ببەستن:

ئێوە ناودارانی کورد حەیفە دواکەوتن لەگەل
دەست بەدەست یەکتر بدەن بۆ گرتنی لوتکەی ئەمەل
عەزم و وریایی و سەباتە بۆ بەدەستهێنانی هەل
دوژمن و بێگانە حەققی میللەت پێ نابێ بەحەل
خوێنی ئەو تانە لەلای خوا عەینی زوهدی زاهدە [2]

هەرلەو ڕۆژگارەدا و لە چوارچێوەی ئەو دۆخە سیاسییەدا هەندێ لە ستایشەکانیش لەو قۆناغەدا ئەرکی سیاسییان پێ بینراوە.

کاتێك کە (شێخ مەحموود) لە کوردستان دوور دەخرێتەوە شاعیرانی کورد بە شیعرەکانیان هەڵوێستی پەرۆشی و جوامێرانەی خۆیان پیشاندەدەن، ئەوەتا (حەمدی) لە ستایش کردنی (شێخ مەحموود)ی نەمر و نەبوونی لە ولات بەنەبوونی پێغەمبەر (د.خ) لەشاری (مەدینە) و شاری (نەجەف) بەبێ (ئیمامی عەلی) دەچوێنێ و دەڵێ:

وەك مەدینە بێ نەبی بێ، یا نەجەف بێ، بێ عەلی
شاری غەزنەش ئێستە بێ مەحموودە وەك داریکەلی

١- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم، دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦: ل ١٧٧ — ١٧٨.
٢- هـ. س : ل ١٧٨ .



حەیفە ئەوجی ئاسمان بێ زینەتی خورشید و ماه
ساخودا بیکەی وەکو خورشیدی رەخشان مونجەلی [1]

لەبۆنەی گەڕانەوەی (شێخ) لە (کوێت) بۆ کوردستان (ئەحمەد فەوزی) بەدەقێکی شیعری جوان و بە پەنابردنە بەر هونەری لێکچواندن لەرەوانبێژی، ستایشی شێخ دەکا و گەڕانەوەی شێخ بە بەربوونی حەزرەتی (یوسف) لەزیندان دەچوێنێ و پلە و پایەی (شێخ) دەگەیەنێتە پایەی شای میسر:

شکرالله مژدەبێ وا نووری ئیمان هاتەوە
ئەرشەد ئەولادی حیدر شێری یەزدان هاتەوە
هەروەکو یوسف لەزیندان ئەسارەت هاتەوە
شاهی میسرە سەد شکور واڕوو بەکەنعان هاتەوە [2]

هەر لە بواری ئاوێتە کردنی بابەتی ستایش بە بابەتە سیاسییەکەوە (بابە علی زادە: نوری) لەستایش کردنی (شێخ) دا دەڵێ:

کەهەڵهات مەهری رووخساری حەفید ئەحمەدی کاکی
هوەیدا بوو لەمولك ومیللەتا ئەسباب رووناکی
طلووعی کردووە ڕۆژی لەبرج دائرەی کوردا
کەمایەی فەخرە بۆ ئەم عالەمە گەر ساحێب ئیدراکی [3]

هەر لەو ڕۆژگارەدا شیعری کوردی لە ئاوێتە کردنی ستایش بەشانازی کردن بە سەربازەکانی (شێخ مەحموود) بەوەی کە بەرامبەر بە داگیرکەرانی ولات (ئینگلیز) وەستاون و بەرەنگاری دوژمنان دەبنەوە بەمەبەستی بەرگری کردن لە خاك و خۆڵی کوردستان و حکوومەتی کوردی، ئەرکی سیاسی پێ بینراوە، (شێخ نووری شێخ سالح) دەڵێ:

١- دیوانی حەمدی، ساغ کردنەوە و لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی جەمال محەمەد محەمەد ئەمین، چاپی یەکەم، چ. ئۆفسێتی، ١٩٨٤: ل٤١ .
٢- ر. بانگی کوردستان، ژ (٨)، ٢٩ ئەیلولی ١٩٢٢: ل ٤ .
٣- ر. ڕۆژی کوردستان، ژ (١٠) س ١، ١٩٢٣: ل ٢ .

**صەف صەف کە دێن و تێئەپەڕن چست باویقار**
**مازی لەسیدقی ئێوە ئەبینم ئەکا فیرار**
**سوبحێکی پاك و بێ غەش ئەبینم وەکو بەهار**
**موستەقبەلێکی بێ لەکە، پڕ کەیف و نەشئەدار**
**بێ تۆزو بێ غوبار**
**ئەی قەهرەمانی عەساکری کورد، لەشکری ویقار**
**ئەی دافیعی وەتەن لەمەزەللەت، لە ئینکسار**
**ئەی نەورە سیدەی وەتەنی مات و غەمگوسار**
**ئەی مایەی تەرەققی میللەت بەئیفتیخار**
**ئەی کوردی نامدار**
**ئێوە مەداری غیرەتی ماددیی میللەتن**
**ئێوە مودافیعی وەطەنی پاك طینەتن** [1]

دیارە کە شاعیرانی کورد لەو قۆناغەدا باش ئاگاداری ئەو پیلانانەش بوون کـــە دوژمنان و دراوسێی کورد بۆ تەنها بەرژەوەندی خۆیان دایان دەڕشت: ((ئەحمەد موختار بەگی جافیش وەك رۆشنبیرێکی ئەوسەردەمە و کەسایەتییەکی دیار بەئاگابووە لـەکاروباری سیاسـی و گۆڕانکـاری ناوچـەکە و کۆنفرانـسە نێودەوڵەتییـەکان کەلـەبارەی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتەوە سـازدراوە، لـەم روانگەیە و بە شیعرە ناودارەکەی لەپەیمانی جێبەجێ نەکەر و دەستی (عصبە الامم) ١٩٢٥ ی زایینی دەدوێت کەسەر زاری چەند مەرج و دەستوورێکیان بۆ کێشەی گەلی کـوردیش خـستووە روو)) [2] بۆیە دەڵێ:

**دێتە گوێم دەنگێ بەسۆز و شیوەن و گریانەوە**
**نالەیی دلە لەحەسرەت خاکی کوردستانەوە**
**لانەواز و بێکەس و مەزلوومن ئێستە قەومی کورد**

١- ڕ. رۆژی کوردستان، ژ (٥)ساڵی ١٩٢٢: ل ٢ — ٣ .

٢- هەڵۆێست لەشیعری کوردیدا (١٨٠٠ — ١٩٧٠)، قومری سەعید عەزیز، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٢: ل ٧٠ .



**گابە دەستی تورکەکان و گابەدەس ئێرانەوە**
**ئیسمی ویجدان و عەدالەت بێ موسەممایە و درۆ**
**بۆ سیاسەت ئەم قسە کەوتۆتە سەرلێوانەوە**
.........................................................
**ئەم قەراری عوسبە وا خەلقی ئەلێن بۆ کورد ئەبێ**
**هەر قسەی ڕووتەو قسە ناچێتە ناو گیرفانەوە** [1]

هـەر لـەو رۆژگارانـەدا کاتـێ باشـووری کوردسـتان لکێنـرا بەعیراقـەوە شـاعیرانی کـورد هەندێکیان پالپشت و لایەنگرییان بۆ ئـەم هەڵوێـستە پیـشانداوە و لـە شیعرەکانیـشیان رەنـگ رێژی ئەم تیروانینە بوونـە، وەك لای (ئەحمـەد فـەوزی) دەبیـنین: ((یـەکێتی عـیراق بـەر لـەوەی بـەبڕیارێکی جیهـانی دانـی پێـدابنرێ لـەدڵی هەسـتیارێکی کـوردەوە بەرزبۆتـەوە و لـە نـاخی دەروونیدا بناغـەکانی دامـەزراون و بووە بە ئاواتێکی خۆش)). [2]

**بۆ ژین ئەگەڕێم، خەلقە ژیانم لەعیراقە**
**بێ پەردە دەلێم ئەمن و ئەمانم لەعیراقە**
.................................................
**باجنسەکەشم کورد بێ ئەما کوردی عیراقم**
**حافی وەطەن و شاهی زەمانم لە عیراقە** [3]

لەپاڵ ئەو بۆچوونەی (ئەحمەد فەوزی)دا هەندێ لە شاعیر و رۆشـنبیری کـورد دژی لکانـدنی کوردستان و کێشەی سیاسی کورد بەعیراقەوە بوونە و لـە شیعرەکانیـشیان دەریـان بڕیـوە، وەك لای (زێوەر) لە شیعری (مال جوێ کردنەوە) دەبینرێ:

**یابە فەرزەن تۆ شای سەر زەمینی**
**رازیم بەبەشی خۆم و ((مسکێنی))**

١- دیوانی ئەحمەد موختار بەگی جاف: ل ٣٤ .

٢- وێژەی کوردی و رەخنە سازی: ل ١٥٢ .

٣- ڕ. ژیانەوە - ژ (١٩) ی ١٩٢٥: ل ٢ .

**(دەجلە و فورات) باهەر بۆخۆت بێ**
**منیش (کوردستان) شاخی رەنگینی**
**هەواکەی ((شاهو)) ئاوەکەی { قەندیل }**
**لا ئەبا لە کورد ئێشی برینی**
**قەت رێك ناکەوێ دەس لەمل یەك کەن**
**{ حنتوش حلاوی } و رەسول (سیرین) ی**
**من لام باش نییە سواری شانم بی**
**واعەرزت ئەکەم هەربە شیرینی**
**خورمای خۆت، بۆ خۆت مێوژم بۆ خۆم**
**((لکم دینکم ولی دینی))** [1]

دیارە نارەزایی لە بەستنەوەی کێشەی کورد بەکێشەی عیراق لای (ئەحمە موختار جاف)یش رەنگی داوەتەوە و عەرەب بە دۆستی کورد نازانێ، بۆیە دەڵێ:

**هێندە حیزە بەختی کورد بۆ کوژتن و تالانیان**
**کۆمەڵێ هاتوون بەسواری حوشتری پێ پانەوە**
**حالی کورد ئێستە لەبەینی تورك و ئێران و عەرەب**
**بێچووە تەیرێکە کەوتۆتە داوی مندالانەوە** [2]

کەواتە لەو قۆناغەدا دەربڕینی بیر و باوەڕی ناسیۆنالیستی کوردی لەشیعرە سیاسییەکان بەتەوژمێکی زۆر بەرجەستە کراوە.

هەرلای (ئەحمەد موختار) شیعری سیاسی ئەرکی بەئاگاهێنانی میللەتی کورد لە بێ ئاگایی و وشیارکردنەوەیان لەهۆکاری دواکەوتوویی نەتەوەکەیان و دابڕانیان لەکاروانی پێشکەوتنی وڵاتانی جیهان پێ بینراوە:

---

١- دیوانی زێوەر، سۆزی نیشتمان، چ. مەعارف، بەغدا، ١٩٥٨: ل ٣٥ — ٣٦ .

٢- دیوانی ئەحمەد موختار بەگی جاف، چاپی دووەمین، چ. هەولێر: ل ٣٤ .



**لەخەو هەلسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە**
**هەموو تاریخی عالەم شاهیدی فەزل و هونەرتانە**
**دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیب و بێ کەس و مە ظلوم**
**بەگورجی قەطعی کەن ئەو رێگە دوورەی والەبەرتانە** [1]

هەر لەو ساڵانەدا شاعیری کورد بە بیر و باوەڕە ناسیونالیستی و شۆڕشگێڕییەکەی رابەر و پشتیوانی جەماوەرەکەی بووە لە وریاکردنەوە و هاندان و پیشاندانی رێگای خەبات و گەیشتن بەئاوات و ئامانجەکانی بەلەناوبردنی هۆکارەکانی دواکەوتن لەبێ ئاگایی و یەك نەگرتن و نەزانی و نۆکەری کردنی بێگانە:

**کوردە تاکەی بێ خەبەربی؟ نوستنت بێ عارییە**
**واسیتەی دواکەوتنت ئەمرۆکە هەربێ کارییە**
**سەیری ئەم قەومانەکە چۆن بوون و ئێستا بوون بەچی**
**حەیفە بۆتۆ وائەسیری بوویتە عەبدو جاریە**
**ئیتفاقێ گەرنەکەی، لەم جەهلە خۆت رزگارنەکەی**
**پاشەڕۆژت قەلبە بە خوا، عەیش و نۆشت زارییە**
**مەرهەم و دەرمانی دەردت ئیتفاقە ئیتفاق**
**دوودڵی مێقرۆبە، خزمە عیللەتێکی کارییە**
**نیوەرۆیە هەستە ئیتر بەرگی سستی داکەنە**
**زوڵمەتی شەو وابەسەرچوو وەعدەیی هوشیارییە** [2]

لەباکووری کوردستانیش دوای پەشیمان بوونەوەی تورکەکان لەو بەڵێن و پەیمانانەی کە بەکوردەکانیان دابوو لە دان پێنانی مافە نەتەوەییەکانیان : ((لەئەنجامی شکاندنی پەیمانی سیڤەر و بەستنی پەیمانی لۆزان کەلە چاکەی بۆرژوازییەتی تورك بوو، شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران تەقییەوە. لەڕۆژی ٢٤ی مایسی ١٩٢٥دا تورکەکان جارێکی تر هێرشێکی دڕندانەیان

---

١- هـ. س: ل ٣٣ .

٢- دیوانی بێ کەس، چاپی دووەم، ئومێد ئاشنا رێکی خستووە، چ، وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥: ل ١٤ .

کردە سەر گەلی کورد، ژمارەیەکی زۆریان لەنیشتمان پەروەران خنکاند و سەری ئافرەت و منداڵیان بڕی و دێهاتیان سووتاند)) [1]، شیعری شین و لاوانەوە لەچەند دەقێکدا ئەرکی سیاسی و پیشاندانی ئەو کارەساتە دڕندانەی تورکی پێ بینراوە.

(حەمدی) بەجوانترین وێنەی شیعری پڕ لە هەست و سۆزی کوردانە باس لەم کارەساتە و بەدبەختی کورد دەکا و لاوانەوەی شەهیدەکان بەستایش کردنیان ئاوێتە دەکا و دەڵێ:

**چۆن زمانی خامەنەشکێ نەپچڕێ روشتەی خەیاڵ**
**کاسەیی پڕ مێشکی کەللە بۆنەبێ یەکسەر بەتاڵ**
**حامی ی قەومی ضەعیف عامیلی عەدل و ئەمان**
**والەکوێ چۆنی بنووسم چۆن بنێرم عەرض و حاڵ؟**

............................................................

............................................................

**چۆن لە صاحێب قودرەتی نەوعی بەشەر طەعنە نەجدەم**
**بۆ لەبەحثی ئێمەدا ئەمڕۆ هەموویان کەڕن ولاڵ**
**بۆ بەژێر بەحرا ئەڕۆن و ئاسمانان کەشف ئەکەن**
**بۆچی ناکەن کەشفی دەردی کوردی بێچارەی شیماڵ؟**
**سەیری ناکەن وەك نیگاری لەوحی تەئریخی بەشەر**
**نەقشی کوورەی ئەرض ئەکا وەك بەحری ئەحمەر خوێنی ئاڵ**
**کێ لەقانوونی بەشەردا دیوێتی ڕاستی بڵێ**
**بێ قەباحەت خوێنی ئەم کوردە لە کوللی کەس حەڵاڵ**
**بۆ بەدارا بکرێ پیاوی تێگەیشتووی قەومی کورد**
**بۆ بنێژرێ نەوجەوانی پێ گەیشتووی وەك نیهاڵ** [2]

---

١- شیعری سیاسی کوردی لە کوردستانی عیراقدا ماوەی نێوان هەردوو جەنگی گێتی، دکتور مارف خەزنەدار، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژ (١٥)، ١٩٧١ — ١٩٧٢: ل ٦١ .

٢- دیوانی حەمدی: ل ١١٤ — ١١٥ .



(پیرەمێرد)یش بە ناوهێنانی شەهیدانی ئەم کارەساتە شیوەن دەکا و دەڵێ:

**هەرچی رەئیسی کورد بوو، بەسێدارە دا کرا**
**باقی بەماڵی خواشەوە، سووتان لەئاگرا**
**کێ دی بەغەیری میللەتەکەم، لەم قەبارەدا**
**ئینشادی شیعری میللی، لە پایەی قەنارەدا**
**شادین و فەخری پێوە دەکەین، بەم حەمییەتە**
**مردن کە بۆژیانی وەتەن بێ، مەزییەتە**
**سەردەفتەری شەهیدی وەتەن، ناوی (خالید)ە**
**وەك ناوی خالیدە، ئەبەدی خۆیشی خالیدە**
**شێخ قادرە ڕەئیسی هەموو خانەدانی کورد**
**میراتی جدی (کوڕ بوو بەڵا بوو) بەئیرسی برد**
**دایکی زەمانە جارێکی تر نایهێنێتە دی**
**لەم کوردەدا غەزەنفەری وەك سەید محەمەدی** [1]

دیارە جەماوەری کورد ملیان کەچ نەدەکرد بۆ ئەو بارودۆخە ناخۆش و ژێر دەستەو زۆردارییەی کە داگیرکەر و نەیارانی کورد لێیان دەکردن و بەسەریاندا سەپاندبوویان، هەربۆیە جەماوەر راپەرینی لە دژی زۆرداران و حکوومەت و دەسەلاتی ئەوسا بە تەنیا رێگا چارەسەر زانی و ئەنجامیشیدا لێرەشدا: ((... باس لەڕاپەرینە مەزنەکەی بەردەرکی سەرا دەکەین (٦ ی ئەیلولی ١٩٣٠) کەلەو رۆژەدا هەڵبژاردنی ئەندامانی پەرلەمانێکی ساختە بوو لەعیراق دا... لەورۆژەدا شاری سلێمانی رۆڵەکانی بەئاشکرا ئاگاداری نەخشە و پلانی دوژمنان بوو. لەهەمان کاتدا بیر لەوە کرابۆوە کە پێویستە پارێزگاری لەکەسایەتی کورد بکرێت بەبێ جیاوازی لەگەل میللەتانیتردا ، خۆپیشاندان دەستی پێکرد تاکو قورسی راپەڕینی بەخۆوە بینی و بەبێ چەك و تفاقی سەربازی رووبەڕووی هێزێکی گەورە و نظامی بوونەوە و ئەنجامەکەشی بە گرتن و کوشتن و بڵاوبوونەوە کۆتایی هات)). [2]

---

١- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بە ژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم، ئومێد ئاشنا، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١ : ل ١٢٧ .

٢- هەڵوێست لە شیعری کوردیدا، نامەی دکتورا: ل ٧٣ .

ئاشکرایە کە شاعیرانیش چ لەرێگەی بەشداری کردن و چ بەهاندانی جەماوەر بۆ راپەرین و کۆڵنەدان لەخەباتی سیاسی و نەتەوەیی یان چالاکییەکانیان بەشیعر ئەنجام دەدا.

بۆیە شیعر ئەمجارە ئەرکی سیاسی بە دەربڕینی خەم و خەفەت و رەنگدانەوەی ئەو کارەساتەی بەردەرکی سەرای کەلە سلێمانی روویدا، بەجارێ دەروونی میللەتی کورد و شاعیرانی بەتایبەتی هەژاندو فرمێسکی بەهەردوولایان رشت، پێ بینراوە: ((بێکەس یەکێك بوو لەو نیشتمان پەروەرانەی سەرکردەیی ئەو راپەرینەیان کرد و برینداریش بوو تیایا. لەئەنجامی ئەو دەورەیدا ئەیگرن و ئەیخەنە بەندیخانەوە. شیعرە بەناوبانگەکەی (ئەی وەطەن مەفتوونی تۆم...)ی لەو بەندی یەدا وتووە)). [1]

**ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە**
**وەختی بەندی و ئەسارەت، پێ بەتەوق و کۆتەوە**
**من لەزیکر و فیکری تۆ غافل نەبووم واتێ نەگەی**
**حەپس و تێ هەڵدان و زیللەت تۆی لەبیر بردۆتەوە**
**بەوخودایەی بێ شەریك و لامەکان و واحیدە**
**عەشقی تۆ نەوعێ لەدڵما ئاگری کردۆتەوە**
**ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی برژێنێتە سەر**
**قەت گڕ و کلپە و بلێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە**
**باسی مەحزوونی و کەساسیی خۆت نەکەی توخوا وەتەن**
**چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە**
**ماتەمینی تابەکەی، دەی پێکەنە و سەر هەڵبڕە**
**موفتەخیر بەشوهرەتت واعالەمی گرتۆتەوە**
**بێ قوسوورە چەند جەسوورە سەد شوکر ئەولادەکەت**
**والەڕێی تۆدا لەخوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە** [2]

١- دیوانی بێ کەس، محەمەدی مەلا کەریم رێکی خستووە، چ. (شەفیق)، بەغدا، ١٩٧٠: ل د .

٢- دیوانی بێ کەس، چاپی دووەم، ئومێد ئاشنا رێکی خستووە، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ : ل ١٥.



بەلای (حەمدی)یەوە ئەو رۆژە کارەساتێکی دڵتەزێن و جەرگ بڕاوی ئەوتۆیە کە هەمیشە لەمێژووی گەلی کورد بە تۆمارکراوی دەمێنێ و لەبیر ناکرێ: ((لەو قۆناغە ناسکە حەمدی توانی پەردە لەڕووی هەموو هەلە و ناتەواوییەکانی هەڵبداتەوە، زیرەکانە تۆماریان بکا، وکو شاعیرێکی رووناك بیر مێژووی رووداوەکان لە وێنەی وا بترنجێنێ کە هەتا هەتایە دەست خۆشی و ئافەرینی بۆ بکرێ)). [1]

**بۆ هەوا ئالۆزە بۆچی لێڵ و سوورە ئاسمان**
**گێژە لووکەی نەگبەتە یا فیتنەیی ئاخر زەمان**
**هەوری قەهری مەوجی دەریایی غەضەب دێنێتە جۆش**
**یافووغان ودووکەڵی ئاهی هەناسە سەردەکان** [2]

هەر لە بازنەی ئەو راپەرینەشدا و: ((لەپاش دامرکاندنەوەی راپەرینەکە، نوێنەرانی دەرەبەگی کورد کە ئەمپریالیزمی بەریتانی پارێزەریان بوو دەستەیەکیان رێك خست بەناوی (وەفدی کوردستان)... دیارە ئازادی نەتەوەی کورد لەچاکەی ئەمانەدا نەبوو، چونکە باوەڕیان بەوە نەدەکرد کە دام و دەزگایەکی کوردی دەتوانی پارێزگاری دەوڵەمەندی و سامانیان بکا. وەفدی کوردستان بەرەو بەغدا کەوتەرێ بۆ ئەوەی سەرشۆڕ بکاو کرنووش بۆ بارەگای مەلیکی عیراق بەرێ و گەلی کوردی شۆڕشگێڕیش بە ئاژاوەچی لەقەلەم بدا)). [3]

بۆیە (پیرەمێرد) لەڕوانگەی سیاسییەوە دەڕوانێتە ئەندامانی وەفدەکە و بە خۆفرۆش و خائینی نەتەوەی کوردیان دادەنێ و لە داشۆرین و هێرش بردنە سەر وەفدەکە دا دەڵێ:

**وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان**
**هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان**
**چەپکێ لەگوڵەکەی، باخەکەی سەرا**

١- لێکۆڵینەوەیەك لە شیعری حەمدی، عبدالله خضر مولود، نامەی ماجستێر، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦: ل ٣٣ – ٣٤ .

٢- دیوانی حەمدی: ل ١٣٦ .

٣- شیعری سیاسی کوردی ماوەی نێوان هەردوو جەنگی گێتی، د. مارف خەزنەدار، گۆڤاری ئەدەبیات، ژ (١٥) ١٩٧١ – ١٩٧٢ : ل ٥٨ .

**کەبەخوێناوی میللەت ئاودرا**
**بیبەنە بەردەم عەرشی عیراقی**
**بلێن یار باقی، هەم سوحبەت باقی**
**پەردەو تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر**
**بلێن پاش کوشتار هێشتا تۆی دلگیر**
**دەك خەجالەت بن لەڕووی مەحشەرا**
**ئێمە خاکی خەم ئەکەین بەسەرا** [1]

دوابەدوای ئەو رووداو و کارەساتانەش هەڵگیرسانی جەنگی دووەمی جیهانی تاکۆتایی هاتنی جەنگەکە (١٩٣٩ – ١٩٤٥) و ساڵانی دوای جەنگەکەش، چەند گۆڕانێکی سیاسی بەسەر هەموو جیهان و بەتایبەتی بەسەر نەتەوە ژێر دەستەکاندا کە کوردیش یەکێك بوو لەو نەتەوانەدا هات.

ئەم گۆڕانانە بوونە هۆی پەرەسەندنی بیری نەتەوەیی و فراوانکردنی بیر و هۆشیاری میللەتی کورد کە لەئاکامدا بووە هۆی دامەزراندن و دروستبوونی چەند پارت و رێکخراوێکی سیاسی کوردی و بڵاوکردنەوەی چەندین گۆڤار و رۆژنامەی کوردی لەکوردستانی عیراق: (حیزبی هیوا، ١٩٣٩) (رەفیق حلمی) سەرۆکی حیزبەکە بوو، ئەندامەکانیشی بریتی بوون لە ئەفسەرە کوردەکان و چینە پێشکوتووخواز و رۆشنبیرەکانی کورد، ئامانجیان خەبات کردن لە دژی فاشیزم و بەدەستهێنانی سەربەخۆیی نەتەوەیی و دامەزراندنی حکوومەتی کوردی بوو. هەروەها لەپاییزی ساڵی (١٩٤٤)دا حزبی شیوعی عیراقی لە کوردستان دامەزراو رۆژنامەیەکیش بەناوی (شۆڕش) کەزمان حالی حیزبەکە بوو دەرکرا. لەزستانی (١٩٤٥)دا حیزبی (رزگاری) و لە (١٦ی ئابی ١٩٤٦)یشدا پارتی دیموکراتی کوردستانی دامەزرا) [2]

ئاشکرایە کە ئەندامانی ئەم پارت و رێکخراوانە هەندێکیان کاریگەربوون بە بیر و باوەڕی مارکسی و (مارکسییەکان بەردەوام هەوڵیان ئەدا چالاکی و خەباتی سیاسی تێکۆشەرانی

١- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بەژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم، ئومێد ئاشنا: ل ١٦٠ .

٢- الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکردیة ١٩٠٨ – ١٩٥٨ ، الدکتور عبدالستار طاهر شریف، الطبعة الاولی، بغداد، ١٩٨٩: ص ٩٧ – ١٠١ – ١١٠ – ١١١.



کوردی لەسەر ئاراستە بکەن، دیارترین سیمای ئەم رێرەوە ئایدیۆلۆژیەش خەبات کردن بوو لە پێناو بەدەست هێنانی سەربەخۆیی بۆ عیراق پێش بیرکردنەوە لە مافە نەتەوایەتییەکانی گەلی کورد)). [1]

بوونی ئەم رێکخراو و پارت و گۆڕانکارییە سیاسییانەی کە بەسەر جیهان و کوردستان بەتایبەتی داهات، بوونە هۆی فراوان بوونی شیعری سیاسی و سەرهەڵدانی رێچکەی ئەنتەرناسیۆنالیزمی.

دیارە کە شاعیرانی ئەو قۆناغە هەندێکیان کە خۆیان ئەندامی ئەم پارت و رێکخراوانە بوون و هەندێکیشیان تەنانەت بە شیعرەکانیان هاوبەش و رەنگرێژی ئەم بیر و باوەڕانەیان دەکرد: ((بەکردنەوەی ئەم رێچکە ئەنتەرناسیونالیزمییە لەناو خەباتکەرانی کورددا شیعری کوردیش سیمای ئەو رێچکەیەی پۆشی و دەستەیەك لەشاعیرانی کورد ئەو رێرەوەیان گرتەبەر و بە بەرهەمەکانیان رەنگی بیر و باوەڕی مارکسی لینینزمیان دەدایەوە و هەر بە پێی ئەم بیر و باوەڕەش مامەلەیان لەگەڵ کێشە و رووداوە سیاسییەکانی ئەو سالانەدا دەکرد)) [2]

دەربڕینی بیر و باوەڕی ئەنتەرناسیونالیزمی و کاردانەوەی ئەم رێچکەیە لە شیعرەکانی (دلزار)دا بەڕوونی دەبینرێ، دیارە کەشاعیر خۆشی یەکێك بووە لەوانەی کە لەپێناو ئەم بیر و باوەڕەدا کاری کردووە، بۆیە بە بۆچوونی شاعیر لابەری خەم و هەژاری و ئێش و ئازار و رزگارکردنی مرۆڤایەتی لەمەینەتییەکانی ژیان و لەناوبردنی چینی زۆردار و سەرمایەدار و بەدەست هێنانی بەختیاری و سەبەرخۆیی گەلانی جیهان هەمووی لەسووپای سوورا بەدی دەکرێ:

**لەشکری سوور، لەشکری ئاسایش و هەرزانییە**
**لابەری دەردی زەبوونی و زیللەت و بێ نانییە**
**بۆ قەلای سەرمایەداری دوودەوی وێرانییە**
**پاسەوانی میهرەبانی کۆمەڵی ئینسانییە**
**ئاگرێکی بێ ئەمانە بۆ خەلەی خونخواری خوار**

١- شیعری سیاسی کوردی لەکرمانجی خواروی کوردستانی عیراقدا (١٩٤٥ – ١٩٥٨)، د. دڵشاد عەلی – محمد فاضل مصطفی، مجلە زانکۆ، ژ (١٠) س ٤ ، ٢٠٠٠: ل ١١ – ١٢ .

٢- هـ. س : ل ١٣ .

**مردنێکی بێ گومانە بۆ سوپای سەرمایەدار**
**جەژنی هێزێکە سوپای سووری بەکاری پێ ئەلێن**
**هەلگری بەیداغی سووری بەختیاری پێ ئەلێن**
**لابەری ئازار و دەردی سەنگە ساری پێ ئەلێن**
**دیمەنی ئاسایش و ئازادی و رزگاری یە**
**کردەوەی دەرکردنی ریشە و رەگی زۆرداری یە** [1]

رووبەکی تری شیعری سیاسی کوردی لەوسالآنەدا ریسواکردنی جەنگ بوو، لەبەر ئەوەی ئاکامی شەڕ تەنها لە ویرانی و کارەساتی دلتەزێن بەدواوە هیچی تری بەدوانایەت، لەو روانگەیەوە شتێکی سروشتییە کە شاعیران دژایەتی جەنگ بکەن، بۆیە (گۆران) دەڵێ:

**دیاری خوای شەڕ: خەشمە و قینە**
**دوشمنییەو، رقە و کینە**
**بەدخواهی یە و نیهادی پیس**
**باری لێکدانەوەی ئیبلیس**
**دیاری خوای شەڕ: پڕ بەدل ترس**
**یەك زمان و صەد هەزار پرس**
**گومان لە راست، بەلام باوەڕ**
**بەدرۆ.. (ئاخ دیاریی خوای شەڕ !)**
**دیاریی خوای شەڕ رەنجە و ئازار**
**مەرگی لەشکر، وێرانیی شار**
**بۆ دایك: تاقانە کوشتن**
**بۆ کۆرپەی ناز: هەتیو خستن**
**خوای شەڕ ئینسان لەهاوجینسی**
**ئەکا بەگورکێکی برسی،** [2]

١- خەبات و ژیان — دلزار، بغداد، ١٩٦٠: ل ١٧ — ١٨ — ١٩ .
٢- دیوانی گۆران، سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، مەحمەد مەلا عەبدولکەریم، **مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد،** ١٩٨٠ : ل ١٩٦ .



هەر لەو سالآنەدا گەلێ لە شاعیران بەو تێڕوانینەیان ئاوێتەی کێشە سیاسییەکە دەبوون و بڕوایان وابوو کە پالپشتی گەلان و بڕبڕەی نەتەوە لە پێشکەوتن و خزمەتکردنی ولاتدا چینی کرێکار و جووتیارە و: ((... مەسەلەی ئازادی نیشتمانی لە جەوهەردا مەسەلەی جووتیارە، بەو پێیەی کە زۆربەی هەرە زۆری گەل لەقۆناغی رزگار بوونی نیشتمانیدا لە ولاتە ژێر دەست و دیل و دواکەوتووەکاندا جووتیارە)). [1]

هەربۆیە شیعری سیاسی کوردی لەم رۆژگارانەدا ئەرکی خستنەڕووی کێشە و گیروگرفتەکانی کرێکار و جووتیار و جیاوازی چینایەتی پێ بینراوە، (دلزار) لەیادی جەژنی کرێکارانی جیهانی ئەرکی هاندان بۆ بەردەوام بوونی کرێکاران لە خەبات لەدژی زۆردار و داگیرکەرانی ولات و یەکگرتن و تەبایی بەدەقەکانی دەبینێ:

**ئێکی ئایاری هەزار و هەشت سەد و هەشتا و شەش**
**پێچەوانەی رۆژها رسکا بەخوێنی سوور و گەش**
...............................................................
**یەکگرن جا ئەی کرێکارانی دنیا یەك گرن**
**هەلبڕن کوت و کەلەپچە و بەندی دیلی هەلبڕن** [2]

(هەردی)یش بە دەقێکی شیعری پشتگیری خۆی بۆ جووتیاران دەردەبڕێ و دەبێتە لایەنگری کێشە و گیروگرفتەکانیان و دژایەتی زۆرداری ئاغا و دەرەبەگ بەرامبەر بەو چینە زۆرلێکراوە دەکات، دیارە ئەمەش لە ئاکامی هەست کردنی شاعیرە بەلێپرسینەوە بەرامبەر بەو رووداو و کارەساتانەی کە لەدوای جەنگی دووەمەوە بەسەر ژیانی سیاسی کورددا هاتووە کە بۆتە هۆی بەرزبوونەوەی هەستی نەتەوەیی و رووکردنە واقیعی کێشەکانی میللەتەکەی:

**ئازادی خوای کوردین ئێمە**
**شورای پۆلا و مەردین ئێمە**
**پشتی جووتیاری زەبوونین**

١- کاروانی شیعریی نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، حەمە حەمە ئەمین قادر (کاکەی فەللاح)، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨: ل ١٤١ .
٢- خەبات و ژیان، دلزار: ل ٣٤ — ٣٦ .

ئالای بەرزی چوون یەك بوونین
شیری دەستی لێ قەوماوین
لەڕووی زوڵما هەڵكێشراوین
ئاغا و بەگزادانی زۆردار
جەردەی گیانی گەلی هەژار
خوێن خۆری ئەم نیشتمانەن [1]

هەرلەكاتی جەنگی دووەم و دوای جەنگەكەش سروودە كوردییەكان ئەركی سیاسییان پێ بینراوە، دیارە ئەم سروودانە بیروباوەڕی تازەی ئەو قۆناغە ئازادیخواز و شۆڕشگێڕانەی كوردییان هەڵگرتووە. لەسروودی (دەمی راپەڕینە)دا شیعر ئەركی هاندانی میللەت بۆخەبات و تێكۆشان و بەرەنگار بوونەوەی دوژمنانی نەتەوەو داوای یەكبوونی ریز و گشت چینەكانی گەل دەبینێ بە مەبەستی بەدەست هێنانی مافی مرۆڤایەتی و پێشكەوتنی كوردستان:

دەمی راپەڕینە، دەمی راپەڕین
هەتا كەی بەسستی و بەپەستی بژین؟
پەلامارده، ئەی كورد، عەرەق رشتنێ
لەدل كرمی ناكۆكی دەركردنێ!
بەیەكبوونە گشت!
پتەو بوونی پشت!
بەیەك بوون ئەبێ
گەلت پێش كەوێ![2]

هەروەها هەندێك لەو سروودە سیاسییانە ئەركی ناساندنی نەتەوەی كورد و بەجۆش خستن و بەرزكردنەوی هەستی نەتەوەیی لای رۆڵەكانی كورد و پێشاندانی رێگای بەرگری و خۆڕاگری میللەت بەرامبەر بە دوژمنانی گەلی پێ بینراوە، هەروەك لە سروودی (ئەی رەقیب)ی شاعیر

١- كاروانی شیعری نوێی كوردی: ل ١٣٩ — ١٤٠ .

٢- دیوانی گۆران: ل ٤٠٣.



(دڵدار)دا دەبینرێ كە تیایدا پێناسەی نەتەوەیی دەناسرێ و بەرەنگاربوونەوە و خۆڕاگری بەرامبەر بەدوژمنانی گەل و نەتەوەی كورد پیشاندەدا:

ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی كوردزوبان
نای رمێنێ دانەیی تۆپی زەمان
كەس نەڵێ كورد مردووە، كورد زیندووە
زیندووە هیچ نانەوێ ئالاكەمان [1]

هەندێ جاریش سروودە سیاسییەكان ئەركی یادكردنەوەی جەژنە نەتەوەییەكانی گەلی كوردیان بەوێنە گرتنێكی واقیعییانەی ئاهەنگەكانیان پێ بینراوە، وەك لە (نەورۆز)ەكەی پیرەمێردا بەدی دەكرێت:

ئەم رۆژی سالی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێكی كۆنی كوردە بە خۆشی و بەهاتەوە [2]

لە رۆژهەڵاتی كوردستانیش لەساڵانی جەنگدا و لەو كەشە سیاسییەی كە ئاڵای كۆماری كوردستانی تیا بەرز كرایەوە چەندین پارت و كۆمەڵە و گۆڤاری وەك: (پارتی ئازادیخوازانی كوردستان (١٩٣٩-١٩٤١) كە بەسەرۆكایەتی (عەزیز زەندی) دامەزرا. دەتوانین بلێین ئەم رێكخراو و بارودۆخە نوێیەی كەلە كوردستانی ئێران هەبوو، بووە هۆی تەشەنە كردنی جۆرێك لە وشیاری نەتەوەیی و سیاسی لەكوردستانی رۆژهەڵات كە بووە ئاكامی دامەزراندنی كۆمەڵەی (ژ. ك) ژیانەوەی كوردستان لە (٦ ی ئەیلولی ١٩٤٢) وە دەركردنی گۆڤارێكی تایبەت بە كۆمەڵەكە بەزمانی كوردی بەناوی (نیشتمان))). [3]

گۆڤاری نیشتمان كەزمان حالی كۆمەڵەی (ژ.ك) بوو، رۆڵێكی بەرچاوی هەبوو لە بزواندن و بووژانەوەی هەستی نەتەوەیی لەناو كوردە رۆشنبیرەكانی كوردستانی رۆژهەڵات:

١- دیوانی دڵدار، شاعیری شۆڕشگێڕی كورد، نووسینی، عبدالخالق علاء الدین، دار افاق عربیه للصحافه والنشر، ١٩٨٥ : ل ١٧٤ .

٢- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەكی نوێ بەژیان و بەرهەمەكانی، بەرگی یەكەم: ل ١٥٢.

٣- الجمعیات والمنظمات والاحزاب الكردیة: ص ٢١٤ — ٢١٧.

((نیشتمان له نووسین و شیعرەکانی دا هەستی نەتەوەیی کوردانی ئەبزواند، هانی ئەدان بۆ یەکێتی و یەکگرتن، بۆ خەبات و بۆ دەرچوون لەدیلی، بۆ هەوڵدانی گەیشتن بە ئازادی.. جووتە شاعیری نەتەوەیی: (هەژار) و (هێمن) زۆری بابەتەکانی نیشتمانیان ئەنووسی و ئامادە ئەکرد)).[1]

هەروەها دامەزراندنی (پارتی دیموکراتی کوردستان ساڵی (١٩٤٥) و شلۆقی بارودۆخی ڕژێم و دام و دەزگای دەوڵەتی ئێران بەهۆی جەنگی دووەم و سوور بوونی کورد لەسەر گەیشتن بە مافەکانی خۆیان، کوردپەروەران ئەم بارودۆخەیان بەهەل زانی بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ تایبەت بەخۆیان، ئەوەبوو لە یەکێك لە کۆبوونەوەی کوردە نیشتمان پەروەرەکان کەلە (٢ ی ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٤) [2] کە بەناوی ئاهەنگ گێران ڕێکخرابوو: ((بەماوەیەك لە (٢٢)ی کانوونی دووەمی (١٩٤٦)دا لە کۆبوونەوەیەکی جەماوەریی فراواندا، لەمەیدانی چوارچرا لەمەهاباد و بە ئامادەبوونی ژمارەیەکی زۆر لە سەرۆك هۆز و عەشیرەتەکان و خەڵکی بازرگان و کاسبکار و جووتیار و پاڵەی کوردستان (کۆماری دیموکراتی کوردستان) ڕاگەیێندرا و بەمە قەوارەیەکی سیاسی و (دەوڵەتی جمهوری کوردستان)لە مێژووی هاوچەرخی کوردیدا هاتە کایەوە)).[3]

شیعری سیاسی لەم ڕۆژگارەدا ئەرکی ڕەنگدانەوەی ئەم بارودۆخەی لە ئەستۆی خۆی گرت، هەر بۆیە شاعیر لە پشتگیری کردنی کۆمارەکە و حکوومەتی کوردی و دەربڕینی خۆشی لە بەدیهێنانی هیوا و ئامانج و خواستی کورد بۆ دامەزراندنی حکوومەتی کوردی و هەڵکردنی ئاڵای کوردی خۆی، (قانیع) دەڵێ:

**سەد شوکور وا من نەمردم، تاکەدیم ئاڵایی کورد**
**کەوتە بەر چاوم بەبەرزی، سوورەت و سیمای کورد**
**باز بوو، دوورابوو دیدەی نەرگسی شەهلایی کورد**

١- حکوومەتی کوردستان، ڕێبەندانی ١٣٢٤، نەوشیروان مستەفا ئەمین، چاپخانەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، هەولێر، ١٩٩٣: ل ٦٥ .
٢- هـ. س: ل ١٢٧ .
٣- ئەدەبی ڕۆژنامەنووسی کوردی سەردەمی کۆماری کوردستان ١٩٤٢ — ١٩٤٧ ، هیمداد حوسێن بەکر، نامەی دکتۆرا، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠١: ل ١٨ — ١٩.



**مژدەبێ ئەمڕۆکە بەربوو، چاوی پڕ بینایی کورد**
**هەر بژی ئاڵایی کورد و پێشەوای زانایی کورد** [1]

لای (هێمن) ئەم ڕۆژە جەژنی کوردە و ڕۆژێکی خۆش و پرشنگدار و نووسراوە لە مێژووی کورد لە بەدیهێنانی سەربەخۆیی و لابردنی تەم و خەم:

**ڕۆژی جێژن و خۆشی یە تێ پەڕبوو ڕۆژی دەردوخەم**
**هات شنەی ڕەحمەت بەجارێك ڕای ڕفاندو بردی تەم**
**جێژنی ئیستیقلالی کوردستانە، ڕۆژی شادیە**
**جێژنە پیرۆزە لەلاوی هاوولاتی خۆم دەکەم**

شاعیر لەهاندانی لاوانی کورد بۆ بەرگری کردن لەم دەستکەوتانە و پاراستنی خاکی کوردستان لە دوژمنانی نەتەوە بە بەرەنگاربوونەوە و خەبات و کۆڵنەدان دەڵێ:

**نۆ جوانان! دەی بەقوربانتان دەبم کارێ بکەن**
**بۆ تەرەققی کورد و بۆ پاراستنی خاك و عەلەم**
**هەر کەسێ بۆ لای سنووری نیشتمانی ئێوە بێ**
**بیکوژن وردی بکەن، چالاکەکان! پێشمەرگەکان!**
**ئێوە شیری لێ بسوون و ئێمە پڕدەینە قەلەم** [2]

لەم قۆناغەدا پێویستی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی میللەتی کورد وای دەخواست کە شاعیری کورد دەبێت پابەندبێت بەژیانی کۆمەڵەکەی، ئەمەش لەڕێگای بەستنەوەی بابەتە شیعرییەکان بەگیروگرفتەکانی ژیان و کۆمەڵگای کوردەواری، دیارە ئەم هەڵوێستە وەرگرتن و پەیامدارییەی (الالتزام) شاعیران بەدەربڕینی حەز و ئاوات و پێویستییەکانی کۆمەڵ و وڵات و پابەندبوونیان پێیان لەئەدەبی عەرەبیش بەتایبەتی لە عێراق بوونی هەبووە و داوای ئیلتزام بوونی شاعیران بە کێشە سیاسییەکان و بەکۆمەڵگاکەیانەوە کراوە: ((بانگێشە کردن بۆ ئەدەبی

١- دیوانی قانع، کۆکردنەوەی بورهان قانع، چاپی شەشەم، چ. والاهو، تهران، ٢٠٠٥ : ل ٩٦ — ٩٧ .
٢- دیوانی هێمن، ١٩٢١ — ١٩٨٦، هەولێر، ٢٠٠٣: ل ١٩٦ .

(ملتزم) بانگەشە کردنە بۆ ئەوەی ئەدیبەکان ئاگاداری دەوروبەری خۆیان لە ململانێی لە نێوان چاکەوخراپە وە لەنێوان حەق و زۆداری هەروەها پەیامی ئەدەبی پابەند بریتییە لە وێنەکێشانی خەباتی کۆمەڵ بۆ سەندنی ئازادی و بەرزکردنەوەی ئاستی کۆمەڵ بۆیە پێویستە لەسەر ئەدیبەکانمان پێشرەوی پێشکەوتن بن و کۆمەل بەرەوپێشەوە ببەن)).[1]

کەوابێ شاعیری پەیامدار بەشیعرەکانی خزمەتی نیشتمانەکەی دەکا و دەبێت ئەرکی پیشاندانی کێشە و گیروگرفتەکانی میللەت و دەربڕی حەز و ئاواتی گەل لە بە دەستهێنانی ئازادی و سەربەخۆیی کوردستان و خستنەڕووی ڕێگای ڕاستی خەباتی نەتەوەیی و نیشتمانی بێ، هەربۆیە پێویستی قۆناغەکە وا دەخوازێ کە شاعیران پشت لە شیعری دلداری بکەن و روو بکەنە خزمەتکردنی نەتەوە و نیشتمان:

**دەمێکە شاعران هەموو بەشیعری ئابدارەوە**
**ئەسیری دەستی ذیلەتن بەزولفی تابدارەوە**
**دەمێکە وەسفی مەی ئەکەن، غەزەل بەمانە طەی ئەکەن**
**بەچاوی مدحی نەی ئەکەن، کە دێتە بەزمی یارەوە**
**لە خوابی غفلت و نەدەم، هەلستە ئەی عەزیزەکەم**
**ئەزانی کێ یە محترم وطن بەبەردو دارەوە**
**ئەوەی نەجیب و عاقلە، وطن پەرست و کاملە**
**نەوەك خەریکی قومری یە، بەسەر چلی چنارەوە**
**خەیالی عاشقی بەسە، وەطە ن غەریب و بێ کەسە**
**هەمیشە سەیری تۆدەکا، بەچاوی انتظارەوە** [2]

هەر لەو سەردەمەدا و لە چوارچێوەی بارودۆخە سیاسییەکەی ئەو رۆژانەدا بوو کە: ((سەرزەمینی ولاتانی جیهانی سێ یەم (ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمریکای لاتین) لەدوای برانەوەی جەنگی دووەمی جیهان و دابەش بوونی هێزە سیاسییەکان بۆ سەر دوو بلۆکی دژ بەیەك، بۆتە شانۆی هەزاران کارەسات و رووداوی توندوتیژی مێژوویی. هاوکات لەگەل سەرهەلدان و

١- نقد الشعر العربي الحديث في العراق: ص ١٧٤ — ١٧٥.

٢- شاعیران، مخلص، گ. گەلاوێژ، ژ (٦)، ١٩٤٥: ل ٣٦ — ٣٧ .



پەرەسەندنی جوولانەوەی رزگاری و ئازادیخوازی لەم ولاتانەدا، ئەدەبێکی تازە بەمۆرك و ناوەرۆکێکی سیاسی شۆڕشگێڕانە لەدەروونی ئەم رووداو و گۆڕانکارییانەدا پەیدابوو، کەبەئەدەبی بەرگری یاخود بەرەنگاری لەقەلەم دراوە)).[1]

(هەژار) لەدەقێکی شیعریدا بەمەبەستی خۆڕاگری و هاندانی پێشمەرگەکانی کۆماری کوردستان بۆ خەبات کردن و بەرەنگاربوونەوەی دوژمنانی کورد و لە پێناوی بەرگری کردن لەکۆمارەکەیان، دەلێ:

**کوڕی کوردی گوردین، نەبەرد و نەبەز**
**لەشەڕ مەست و سەرخۆش نابین وەرەز**
**هەموو پەنجەمان ئاسنین و قەوی**
**لەبەر هەیبەتی مە دەلەرزێ زەوی**
**هەموو بێچوە شێرانی شێر هەڵدڕین**
**وەکو بەبری ئازا و پلنگی دڕین**
**ئەجەل والە لوولەی تفەنگی مەدا**
**رەها نابێ دوژمن لەچەنگی مەدا** [2]

شیعری بەرەنگاری کەئەرکی سیاسی پێ بینراوە، تیایدا شاعیرانی کورد پەروەر و خەمخۆری نیشتمان هەریەکەیان بەجۆرێك لەشیعرەکانیان بەرەنگاری دوژمن و نەیارانی میللەتەکەیان دەبوونەوە، ئەم جۆرە شیعرە ئەرکەکەی زیاتر لە کاتی جەنگ و شکستەکانی نەتەوەو ولات و شەهید بوونی لاوە کوردەکان و هەندێ جاریش لە پێناو خۆڕاگری و پاراستنی دەستکەوتە نەتەوەییەکاندا، دەربڕاوە: ((هەر شاعیرێك بەجۆرێك هەستی نارەزایی دەردەبڕێت و بارودۆخی ولاتە داگیرکراوەکەی دەگێڕێتەوە و نالەباری و سەختی رەت دەکاتەوە بە شێوازێکی کاریگەری بەجۆش بەجۆرێکی ئەوتۆ هەستی مرۆڤی کورد دەبزوێنێت، هەروەها هاندان و ستایش بەهاکانی ئازایەتی و قارەمانێتی و بەرگری و بەرخۆدان دەکات)).[3]

١- ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەلایەتی لەشیعری هێمن، عوسمان حەمەد خدر (دەشتی)، نامەی ماستەر، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠١ : ل ٥٩ — ٦٠ .

٢- هەژار بۆ کوردستان، چاپی چوارەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١: ل ٤٥٣ .

٣- هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروو، ١٩٣٩ — ١٩٧٠، د. عەبدوڵلا یاسین عەلی ئامێدی، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر : ل ١٨٠ .

کاتێـك لـە کوردسـتانی ڕۆژهـەڵات کـە خـەونی خۆشـی کوردپـەروەران لەکوردسـتانێکی سەربەخۆدا ساڵێکی کەمتر خایاند ((کۆماری دیموکراتی کوردستان ٢٢ / ١ / ١٩٤٦ — ١٥ / ١٢ / ١٩٤٦))[1] بەڕووخانی کۆمارەکە و لەسێدارەدانی دامەزرێنەر و کاربەدەسـتانی، دەروونـی میللەتی کوردی لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا بەجارێ هەژاند و ئەو دام و دەزگا و گۆڤار و ڕۆژنامانەی کەلە سێبەری کۆمارەکـەدا دامـەزرابوون و لەخزمـەتی کوردایـەتی و پـێش بردنـی کۆمارەکەدا بوون، هەر هەموویان لەناوبران، بۆیە ئەم کارەساتە دڵتەزێنە گڕ و کلپەی دەروونـی شاعیران و نیشتمان پـەروەرانی کـوردی بـەجارێ سـووتاند و شـاعیران جارجـار بـەتێڕوانینێکی ڕەشبینانە و دڵێکی پڕ لەنائومێدییەوە دەیانڕاوانییە ژیان و ڕۆژانی دوای نەمانی کۆمارەکـە و بە ڕۆژگارێکی ڕەش ناویان دەبا، لای (هێمن) کە ڕۆژانی کۆمارەکـە جـەژن و شـادی بـوو بـەڵام جەژنی ئەم جارە تاڵە و خۆشی و شادی لای شاعیر نەماوە، شـاعیر وەسـتایانە وێنـەی واقیعـی سەرتاسەری کورد و ئەو ڕۆژە ناخۆشانە دەکێشێ و دەڵێ:

**ئەو ساڵ جێژنەمان تاڵە**
**دوژمنی زاڵم زاڵە**
**لاو جێیان سیاچاڵە**
**دەستی دۆیان بەتاڵە**

* * * *

**گاڵتە و گەپ و پێکەنین**
**شەو داوەت و هەڵپەڕین**
**جێگای خۆیان دا بەشین**

* * * *

**داخرا دەرکی ڕۆژنامە**
**شکاون نووکی خامە**
**کوردی نووسین حەرامە**
**دوژمن دەڵێ بێ تامە**[2]

---

١- ئەدەبی ڕۆژنامە نووسی کوردی سەردەمی کۆماری کوردستان ١٩٤٢ — ١٩٤٧، هیمداد حوسێن بەکر، نامەی دکتۆرا: ل ١٨ .

٢- دیوانی هێمن: ل ١٨٨ — ١٩٠ .



(قەدری جان)یش بەمەبەستی دەربڕینی هەستی کوردایەتی و سـۆز و خۆشەویسـتی خـودی شاعیر بەرامبەر بەسەرکردە و پێشەوا و قارەمانی شۆڕشگێڕی کورد (قازی محەمەد) و لەئاوێتـە کردنی لاوانەوە بەستایشی پێشەوای کۆماری کوردستان دەڵێ:

**ئەفسووس !.. ئەفسووس**
**چ دەردەکی گرانە**
**برینەك بێ دەرمانە**
**ژ دل نالین**
**ژ دەڤ، کالین**
**هەزار ئاه، هەزار زارین**
**ژ چاڤێن مە هێسترین خوین**
**تێنە جۆش.. تێنە خرۆش**
**دبیژن کو ئەو عەجەمێن ئەفیۆن کێش**
**ئەسرار کێش**
**ب دەستێن خوە بێن گەماری**
**دانین سێپا خوین خواری**
**سەری پێشەوا وادانە پێش**
**ئەو ڕێبەرێ بێ هەمتا**[1]

لەگـەڵ ئەوەشـدا گـەڵێ جـار لـەم قۆناغـەی ماتەمینەشـدا شـاعیری کـورد بەورەیـەکی بـەرز و خۆڕاگری و چاو نەترسییەوە شیعری بەرەنگاری دەڵێ و داوای تۆڵەی شەهیدانی کۆمارەکەی دەکا:

**ڕۆڵەی کوردی بلیمەت**
**نەترسا لەدار و پەت**
**پشتی نەکرد لە میللەت**
**وادەبێ زبیك وهیممەت**

* * * *

---

١- قەدری جان شاعیری داهێنەر و نیشتمانپەروەر، ئازاد عەبدولعەزیز مزووری، چاپخانە وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٢ : ل ١٤٦ .

**بەلام کوردە نابەزی**
**بەو زەبرانە ناتەزی**
**لەرقان لێو دەگەزی**
**کە سوار بوو دانەبەزی**
**داخدار، خوێنی دیوە**
**بێدارە، خۆی ناسیوە**
**لەدوژمن راپەریوە**
**باسکی لێ هەڵمالیوە** [1]

بەهەمان شێوە لای (پیرەمێرد)یش شیعری شیوەن و لاوانەوە ئـەرکی سیاسـی پـێ بینـراوە، وەك لە شیوەنی بۆ ئـەو چـوار ئەفـسەرەی کەبەدەسـتی حکوومـەتی بەغـدا لەسـێدارە دران کـە (خیرولّلا عبدوالکەریم، محەمەد مەحموود قودسی، عیزەت عەبدول عەزیز و مـستەفا خۆشـناو) بوون و ئەندامی چالاکی کۆماری کوردسـتان بـوون، شـاعیر لـە هەسـت کـردن بەلێپرسـینەوە و بەرزبوونەوەی حەماسی نەتەوەیی و ستایشی ئازایەتی و خۆڕاگری شەهیدەکان دەڵێ:

**دیسان وا کۆستی نوێمان کەوتەوە**
**گەڕی گەردوونە، کوردی گرتەوە**
**ئەم دوو دار تەرمە، دوو نەڕە شێرە**
**زنجیریان پچران، گەیینەوە ئێرە**
**لەرێی ئێمەدا گیانیان فیداکرد**
**ناوی بلندیان، وابۆ خۆیان برد**
**ئەو پەتەی لەملی ئەمانە خرا**
**ئەوانی خنکاند، بەلام پەت پچڕا**
.............................................
**ئەم جووتە شێرە، دلێری شەرزە**
**لەناو مێژوودا، ناویان زۆربەرزە**
**هیچ پێیان ناوێ کفن و دفن و شین**
**شەهیدان لەناو دڵمانا ئەژین** [1]

(بێ کەس)یـش لـەم بۆنەیـەدا خـۆڕاگری و بـەرگی رۆلـەکانی گـەل پیـشاندەدا و پێـی وایـە کەخوێنی ئەو شەهیدانە بەفیرۆ ناڕوات و لەڕێی بەختیاری و سەرفرازی گـەل و نەتـەوە گیانیـان بەخت کرد.

**قەومی کورد ئیسپاتی کرد بۆ عالەمی سەر رووی زەمین**
**میللەتێکی قارەمانن هەر ئەبێ سەربەست بژین**
**میللەتێ لاوی لەرێگەی سەربەخۆیی نیشتمان**
**بێتە بەر سێدارە، بێ ترس، دەم بەخەندە و پێکەنین**
**قەومی وانامرێ، ئەژی، بادوژمنی هەر شەق بەرێ**
**ساحێبی رۆلەی نەبەردە ؟ خاونی عەزمی مەتین**
**ئەوکەسەی گیانی لەرێگای نیشتمانا بەخت ئەکا**
**پێی مەلێن مردوو، شەهیدە والە فیردەوسی بەرین** [2]

ئاشـکرایە کـە عـیراق لـە چلەکانی سـەدەی رابـووردوودا پـڕ بـوو لـە رووداوی سیاسـی و کارەساتی مێژوویی و راپەرین: ((مێژووی نوێ و هاوچەرخی عیراق پڕییە لـە لاپـەڕەی خـەباتی خوێناوی دژی داگیرکەری بێگانە و کۆنەپەرستی ناوخۆ، یەکێك لـەو لاپـەڕە پیرۆزانـە راپەرینـە گەورەکەی کانوونی دووەمی ساڵی (١٩٤٨)ە)) [3].

لە راپەرینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٤٨ دا سەرتانسەری میللەتی عـیراق بـەکورد و عـەرەبـەوە بەشدارییان تیاکرد، ئەم راپەرینەش کەلـەدژی بەسـتنی (پـەیمانی پۆرنـسمۆث)ی ١٥ی کـانووی دووەمی ١٩٤٨ لەبەریتانیا لە نێوان حکوومەتی عیراقی بەسەرۆکایەتی ساڵح جەبرو ئەندامەتی

---

١- دیوانی هێمن: ل ١٩٤ — ١٩٥ .



---

١- پیرەمێرد، ئومید ئاشنا، بەرگی یەکەم: ل ٣٤٣ — ٣٤٤ .
٢- دیوانی بێکەس: ل ٣٦ .
٣- چەند لاپەرەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، د. کەمال مەزهەر، چ. (الادیب البغدادیە) بەغدا، ١٩٨٥: ل ٢٠١ .

نوری سەعید و... لەگەل نوێنەرانی لەندەن دا مۆرکرا و: ((بەندەکانی ئەو پەیمانە عیراقی توندتر بە بەریتانیاوە دەبەست و سەرانسەری خاکی عیراق بۆ ماوەی بیست سالی رەبەق بووە بنکەیەکی بەریتانی و کلیلی زۆرلایەنی ژیانی سیاسی و ئابووری و کاروباری سوپای دابووە دەست ئینگلیز)). [1]

هەواڵی بەستنی ئەم پەیمانە هەموو گەلی عیراقی هەژاند و مەترسی کەوتە دلی جەماوەری عیراق بە کورد و عەرەبیەوە ، هەربۆیە زۆر بەخێرایی گەلی عیراق بەگشتی راپەرین و خۆپیشاندانیان لەدژی ئەو پەیمانە ئەنجامدا، شۆرش و راپەرینەکانی پێش ئەو راپەرینە لە کوردستان رێگە خۆشکەر بوون بۆهاندانی هەموو نەتەوەکانی تری عیراق بۆ راپەرین، گەلی کوردیش چالاکانە بەتایبەتی ئەو رێکخراو و حیزبانەی کەلەبەغدا سەنتەریان هەبوو، وەك حیزبی شیوعی و پارتی دیموکراتی کوردستان و چەندانی تریش کارە نەتەوەییەکانی خۆیان لەریکخستنی راپەرین و دیارکردنی ئامانجەکانی، کارەکانی خۆیان ئەنجام دەدا.

هەر لە ئاکامی هاوبەشی کورد و عەرەب لەم راپەرینەدا برایەتی کورد و عەرەب زیاتر پەرەی سەند و شیعری سیاسی ئەم رۆژگارانە ئەرکی وێنەی ئەم بارودۆخەی لە شیعرا بۆ جەماوەری کورد کێشاوە.

(بێ کەس) زیرەکانە ئەم برایەتییەی بەگەلی عیراق راگەیاندووە ((دروشم و چەمکی خەباتی ئەم قۆناغە لە شیعری بێکەس دەنگی داوەتەوە و گیانی شۆرشگێری وەبەر بەژنی شیعرەکانیدا کردووە و نموونەی بەرزیشی لە (داری ئازادی)یەکەیدا دەردەکەوێ، لەو دروشم و چەمکانە، برایەتیی کورد و عەرەب و خەباتی تێکرایی گەلی عیراق دژی داگیرکەر و کۆنەپەرستی، توانای بەرەنگاربوونی هێزەکانی ئیمپریالیزم کە جاران وا دەبینرا کە قاو هەموو هەولێك دژی ئیمپریالیستێکی وا گەورە و بەهێزی وەکو بریتانیا بێ کەلکە، تێکۆشانی سیاسی رێگەی رزگارییە، ئەمەش بەلایەنی چاکسازی نایەتە دی بەلکو دەبێ سەر شاری هەلمەتەکە شۆرش و خەباتی شۆرشگێرانە بێت)) [2] و دەڵێ:

**ئەم عیراقە خۆشەویستە خاکی گول گوون بوو بەخوێن**
**تاحەقی دەسگیرنەبێ لەو خوێنە دەست هەلناگرێ**
**واگلۆلەی کەوتە لێژی باوی ئیستعمار نەما**

١- هـ. س : ل ٢٠٨.

٢- بێ کەس و شیعری سیاسی، عبدالرزاق بیمار، گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە (١)ی ١٩٨٥، ل ٢٢.



**هیچ کەسێ ئیتر بەزورناو تەپلی ئەو هەڵناپەرێ**
**دۆستی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تەئریخ شاهیدە**
**ناحەزی رووڕەش لەداخا بایەخەی خۆی دادڕێ** [1]

پیرەمێرد ئەمجارە بەتێروانینێکی نوێ و گەشبینانە دەڕوانێتە دوارۆژی گەلەکەی و ستایشی شەهیدانی گەل و راپەرینەکە دەکا و: ((پاش راپەرینی گەلی عیراق لەکانوونی دووەمی ١٩٤٨ دا، واز لەگریان ئەهێنێ، ئەمجارە لای گۆری ئەم دەستە شەهیدە تازەیە، وەك جاران ناگری)) [2] و دەڵێ:

**ئەو رەنگە سوورە بوو، کەلە ئاسۆی بلندی کورد**
**مژدەی بەیانی، بۆ گەلی دوور و نزیك ئەبرد**
**ئەوا رۆژ هەلات لەبەندەنی بەرزی ولاتەوە**
**خوێنی شەهیدە، بەرەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە**
**تا ئێستە رووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا**
**قەلغانی گوللە، سنگی کچان بێ لە هەلمەتا**
**پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین**
**نامرن ئەوانە، والەدڵی میللەتا ئەژین** [3]

چەوساندنەوەی ئیمپریالیزم و ولاتە بالادەستەکانی جیهان و پاشماوە خراپەکانی کە جەنگی دووەمی جیهانی جێی هێشت بوو، هەستی گەلان و مرۆڤایەتی دەبزواند بەتایبەتی لای ئەو میللەتانەی کەخۆیان ژێردەستە و ماف خوراو بوون و لەهەمان واقیعی ژیانی ئەو گەلە زۆرلێکراوانەدا دەژیان.

١- دیوانی بێ کەس: ل ٣٨ .

٢- ئەدەبیاتی نوێی کوردی، دکتور عیزەدین مستەفا رەسوول، بەرێوەبەرایەتی چاپخانەی فێرکردنی بالا، هەولێر، ١٩٩٠: ل ٧٩ .

٣- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیەکی نوێ بەژیان و بەرهەمەکانی، ئومێد ئاشنا، بەرگی یەکەم: ل ١٥٢.

دیاره ئەم هەستانە لە پەنجاکانی سەدەی بیستەم دا لای شاعیر و رۆشنبیرانی کورد زیاتر چەکەرەی کرد و گڕی لەدەروونی شۆڕشگێڕان و ئازادیخوازان بەردا و بووە هۆی داهێنانی ئەدەبێکی نوێی سیاسی کە بەئەدەبی مرۆڤایەتی و ئاشتیخوازی ناوی دەرکردبوو: ((لەو سالانەدا ئاشتی بووبووە پێویستییەکی گرنگ و ئەرکێکی ئەنتەرناسیۆنالیزمی و دیاردەیەکی شارستانی و لەسەرتاپای جیهاندا بانگەوازی بۆ دەکرا بەبنج داکوتانیشی هیوا و ئاواتی گەلانی دونیا چرۆی دەرکردەوە، پاش ئەوەی کارەساتەکانی جەنگی دووەمی جیهانی کەشێکی رەشبینی بەدوای خۆیدا هێنا و تارمایی شەڕی سێیەمیش بەچەکی ئەتۆمییەوە، هێندەی تر کەشەکەی فراوان دەکرد و تۆوی نائومێدی دەچاند، هەربۆیە بزووتنەوی ئاشتیخوازی بووبووە ئەو روانگەی ئاواتەی کە دوارۆژێکی گەشی مرۆڤایەتی لێ وە دەبینرا هەمان روانگەش لەسەر ئاستی ناوخۆی عیراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی لەو سالانەدا، بووبووە ئەو بنکە شۆڕشگێڕییەی کە تێکۆشەرانی لەدەور کۆبووبووەوە)).[1]

شاعیرانی کوردی ئاشتیخواز و تینووی سەربەخۆیی و دیموکراسی بەشیعرەکانیان رابەری ئەم رێچکە ئەدەبییەیان دەکرد و ڕەنگی دیلی و چەوساندنەوەی گەلانی لێقەوماویان بەگەلی کوردی ستەم لێکراو دەناساندو بەیەکتریان دەچواند و لەڕێگای هاوخەباتی نەتەوەیی و سیاسی و نیشتمانییانییەوە بەیەکەوە گرێ یان دەدان، (هەژار) لە (پەیام بۆ ماو ماو) دەڵێ:

**ماو ماو من و تۆ دوو دۆستی هاودەرد**
**بەخوێنی گەرم و بەهەناسەی سەرد**
**هەردوو گیرۆدەی دەست ئیستعمارێك**
**هەردوو مارانگاز بەنێشی مارێك**
**ئەو وەحشەی بەدەم کینیا مژە**
**بەجووتە و چەپۆك کوردستان کوژە**
**من و تۆ ماڵمان بەرەڵڵا و بێ خێو**
**پڕ نەوت و گەنم پڕ لەزێڕ و زێو**[2]

١- دیلان و تاقیکردنەوەی شیعری، دلّشاد عەلی محەمەد، نامەی دکتورا، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦ : ل٨٢ .

٢- هەژار بۆ کوردستان، چاپی چوارەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١ : ل ٥٥ .



هەر لە بواری شیعری مرۆڤایەتی و ئاشتیخوازی شیعری سیاسی کوردی لە ئاوێتەکردن و چواندنی خەباتی سیاسی و مرۆڤایەتی رۆڵەی کوردی چەساوە بەگەلانی جیهان، (کامەران) لە دەقی (جەمیلە)دا هەستی کوردانە و مرۆڤ پەروەر و ئاشتیخوازانەی ئەجولێ و هەلوێستی مەردانە و سلاوی رۆلەی کوردی قارەمان و کۆڵنەدەر لەکوردستانەوە بەنیشتمانی کچی ئازا و چاونەترسی جەزائیری دەگەیەنێ و دەڵێ:

**لەهەموو شوێنی کوردستان**
**باسی تۆیە ئەی قارەمان**
**چونکە کچ و کوڕی ئێمەش**
**کەڕوو ئەکەنە گڕی گەش**
**ناترسن وەکو تۆ ئازان**
**لەمەرگ و سزا، بێ پەروان**
**(کچەکەی نەغەدە بەخشی)**
**(بۆ کورد هەردوو چاوی گەشی)**
**ئەی کیژۆلەی بۆمبا هاوێژ**
**بانگ ئەکەین (زۆرداری خوێن رێژ)**
**نەکەی دەس و پەنجەی مردن**
**(تەور) درێژکەی بۆ گەردن**
**(تاوانبار دانێ تەورەکەت)**
**ژێر ناکەوێ هێزی میللەت**
**ئەی خاکی ئاگر و ژیلە**
**هەزار سلاو لە جەمیلە**[1]

هەرلەو قۆناغەدا تەنانەت هەندێ لە چیرۆکە شیعرییەکانیش ئەرکی سیاسییان پێ بینراوە.

١- دیوانی کامەران موکری، پیشەکی نووسین و پەراوێز لێدان، عەبدوڵڵا عەزیز خالد، **الطبعة الاولی**، مدیریة مطبعة الثقافة والشباب، ١٩٨١: ل ١٠١ .

لەچیرۆکە شیعری (بۆ مێژوو) ئەرکی دەربڕین و پیشاندان و گێڕانەوەی خراپەکاری دەسەڵاتی سیاسی و کاربەدەستانی حکومەتی عیراقی لەساڵانی پەنجاکانی سەدەی بیستەمی ئەنجامداوە، (شێخ نووری شێخ سالح) لە دەقێکی شیعریی دا بە جوانترین تابلۆی شیعری وێنەی زۆرداری و چەوساندنەوەی دەسەڵاتی (عومەر عەلی) کە (موتەسەریفی شاری سلیمانی ساڵانی (١٩٥٤ — ١٩٥٧) * بووە، بەرامبەر بە دانیشتوانی شاری سلیمانی کێشاوە: ((هوشیاری سیاسی شێخ نووری وای کردووە کەلە رووداوەکانی ئەو سەردەمە دووره پەرێز نەوەستێ، بەڵکو بەکار و بەشیعر تێکۆشاوە بۆ ئەوەی پیلانی دوژمنان بپوکێنێتەوە و گەنجەکان بۆ ئەوە هان بدا کەدژی داگیرکەر خەبات بکەن و نیشتمانی خۆیان لە ژێر دەستی داگیرکەری بێگانە رزگار بکەن)).[1]

**دوژمنی گەورەی نیشتمان**
**(عومەر عەلی) وانار بۆمان**
**خۆی دوژمنی کوردەواری**
**دوژمنێکی شیرە خواری**

ئینجا (شێخ نووری) لە پیشاندانی هەڵسوکەوت و جولانەوەی خراپی و زۆرداری ئەو دەسەڵاتە، دەڵێ:

**کەچی نرخی حەق گران بوو**
**ناحەقیی ئێجگار هەرزان بوو**
**گەراجەکانی ناو شاری**
**دەزگای داخست بەزۆرداری** [2]

* بڕوانە دیوانی شێخ نووریی شیخ سالح، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، ئازاد عەبدولواحید، **مطبعة الجاحظ، بغداد**، ١٩٨٩: ل ٢٦٢ .

١- دەوری شیخ نووری شیخ سالح لە نوێ کردنەوەی شیعری کوردیدا، کویستان جەمال سەلام، نامەی دکتورا، زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠٤: ل ١٠٣ .

٢- دیوانی شێخ نووری شیخ سالح، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم: ل ٢٦٣ — ٢٦٥ .



هەرلەو ساڵانەدا کۆچی دوایی (شێخ مەحموود)ی نەمر بووە هەوێنێکی تری شیعری سیاسی و لە دەقێکی تری (شێخ نووری شێخ سالح)دا کەبۆ لاوانەوەی (شێخ)ی نەمری وتووە و تیایدا ئەرکی دەربڕینی هەستێکی راستگۆیانەی پڕ لە وەفا و خۆشەویستی و کارتێکردنی ئەو کارەساتە دڵتەزێنە لەسەر دەروونی شاعیر بەشیعرەکە بینیوە.

شاعیر لەم شیوەنەیدا سەرەتا بە تێڕوانینێکی رەشبینانە سەیری رۆژانی داهاتووی خۆی و نەتەوەکەی دەکات و وڕەی تەواوی بەرداوە. بە بۆچوونی (شێخ نووری) شار لە دوای نەمانی (شێخ) هەمووی خەمبارە و تازییەیان داناوە و دانیشتوانی شاری سلێمانی هەمووی رەشپۆشن و شاریش چۆڵ بووە و ژیانی تێدا نەماوە، تەنانەت رەشبینی شاعیر دەگاتە رادەی ئەوەی کە بەلایەوە ئیتر هیوا و ئامانجی (ئامالی کورد بنچینەکەی رووخا) کورد لەرەگەوە دەرچووە و نەما، (ئازاد عەبدولواحید) لەبارەی رەشبینی شاعیر بۆ دوارۆژی کورد دەڵێ: ((هیچ گومانی تێدا نییە کۆچی دوایی شێخ مەحموودی نەمر، زامێکی قووڵی کردە دڵی میللەتی کورد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەلای منەوە ئەو بەیتە پێویست بوو بە جۆرێکی تر و لە ماناپەکی تردا بووترێت چونکە بەکۆچ کردنی قارەمانێك قەڵای (ئامالی) میللەتێك ناڕووخێت.))[1]

**چ نووکێ خەنجەرێ بوو وابڕی ریشەی دڵ و گیانم**
**چ تینی ئاگرێ بوو وا بەجارێ جەرگی سووتانم**

.................................................................

**پەژارە و خەم سەری هێنایە دەر بەم تاوە بارانە**
**وەری گۆپکەی چناری عەیش و نۆشی سەرچنارانم**
**ئەمەل نێژرا لەناو خاکا، ئەلەم گۆپکە و چرۆی دەرکرد**
**بەجارێ هەڵکرووزا سەبزە زاری نەو بەهارانم**

.................................................................

**وەکو (غەزنە) بەچۆڵی مایەوە شاری ((سلەیمانی))**
**لەدوای تۆ شار و لادێ بوو بەکولبەی ماتەم و ئەحزان**
**وەتەن دانیشتووە بۆ تەعزییە و بۆ فاتیحا خوانی**
**بەکۆچی تۆ قەڵای ئامالی کورد بنچینەکەی رووخا**

١- دیوانی شیخ نووری شێخ سالح، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم: ل ١٤٣ .

**بەلافاوی خەفەت شاری ئەمەل رووی کردە ویرانی** [1]

ئەگەر چی (شێخ نووری) لەم دەقەیدا رەشبینە، بەڵام لەدەقێکی تریدا کە دەربارەی کۆچی دوایی شێخ (مەحموود)ە و باس لەو کارەساتە دەکا کە لە هێنانەوەی جەنازەکەی (شێخ) دا رووی دا، بەدەنگێکی دلێر و گەشبینانەوە دەڵێ:

**من سەروەری وڵاتم و سەرداری قەومەکەم**
**بمرێ بەئێشی دەردی دڵ و ئیحتیقارەوە!**
**من بێم لەبەر رەزای دڵی تۆ یا یەکێکی تر**
**ناموسی کوردەواری بنێمە کەنارەوە؟!**
**تۆ و ئەو کەسەش کەوای وتووە باشی تێبگەن**
**کورد نایەوێ بژی بەلەکەی، عەیب و عارەوە** [2]

لای (دیلان)یش شێخ بەکردەوەکانی هەر زیندووە و نەمردووە، چونکە ئەو رێگەی کە شێخ بۆ کوردایەتی لەسەری رۆیشتووە و نەوەکانی دوای خۆی لەسەر هەمان رێچکە و رێبازی ئەو بەردەوام دەبن لەتەواوکردنی خەباتی سیاسی و نیشتمانی و کارەکانی شێخ و شوێن پەنجەی شێخ بەچۆلی ناهێڵنەوە:

**بەلام.. بەرانان گۆم لێ راگرە**
**من کوردم کوردیش گەلە، ئینسانە**
**هەزار ئەوەندە بخرێتە بینی**
**دەستی گەردوون و چنگی زەمانە**
**کورد شۆڕە سواری وەك شێخی بووبێ**
**سەرنەوی ناکا لە بۆ بێگانە**
**ئەو رێیەی کە تۆ گرتت لەژینا**
**ئێستەش بەجێت هێشت بۆ رۆلەکانت** [3]

١- هـ. س : ل ١٤١ – ١٤٢ – ١٤٣ .

٢- هـ. س : ل ١٥٤ .

٣- دیوانی دیلان، بەغدا، چ. ئەسعد، ١٩٦٩ : ل ٨٢ – ٨٣ .



لەپاڵ ئەم بوارانەی شیعری سیاسی دا دەبینین هەندێ جار شیعری سیاسی لەرێگەی گاڵتەجاڕی یەوە ئەرکی خۆی ئەنجامداوە، بەتایبەتی لەپەنجاکانی سەدەی بیستەم و لە ئاکامی پەستی و بێزاری شاعیران لەبارودۆخی سیاسی و کۆمەلایەتی و نائارامی ئەو سالانە، بۆیە شاعیران بەدوای بابەتی نوێ دەگەڕان تا بیری خوێنەر بۆ لای خۆیان راکێشن و ئاسۆی بیرکردنەوەشیان فراوانتر بکەن. ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبی عەرەبیش دا بوونی هەبووە و بەشیعری پێکەنیناوی ناوی دەرکردووە: ((شیعری پێکەنیناوی ئەو شیعرەیە کە بەشێوەی میللی ژینگە لە ئامێز دەگرێ و تیایدا کێشە و نوکتەکانی کۆمەڵ دەگێڕێتەوە بەشێوەیەکی کێشدار و قەشەنگ کە پڕێتی لە پەند و ئامۆژگاری هەروەها هەندێك لەشاعیران شیعری پێکەنیناوی دەکەن بەئامرازێك بۆ گەیاندنی پەیامێکی دیاریکراویان)). [1]

شیعری گاڵتەجاری لەو قۆناغەدا زیاتر لە رێگەی رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانەوە بڵاو دەکرانەوە.

ئەم جۆرە شیعرە هەرچەندە لەپێش پەنجاکاندا بوونی هەبووە بەڵام لە نیوەی سەدەی بیستەم بەو لاوە زیاتر لەسەر دەستی (گۆران)ی شاعیر گەشەی سەندووە و بایەخی پێدراوە: ((... شیعری کۆمیدی، پێکەنیناوی وەك بابەتێکی پلار و تەشەری گەرم و رەخنەگرانەی خۆش بابەتێکی سەرکەوتوانەی بایەخ پێدراوی (گۆران)ە. ئەم شێوەیە تینووی سەرنجی وردو خەیاڵی تیژو ناسك و دۆزینەوەی گرێ و گۆلی کۆمەلایەتی و دەروونی و سیاسییە...)) [2]

گۆران لەباسی (عەلی حیجازی)دا * بەشێوازێکی گاڵتەجارییەوە باس لەدەسەلاتێکی سیاسی دەکا: عەلی حیجازی لەساڵی ١٩٥٠ دا بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس بوو، ویستی کودەتایەك بکا، گوایە مەبەستی دەرکردنی سالح جەبر بووە، دەڵێ:

١- الخیال الفکاهي، عبدالله البطاشي – عادل الکلدي، مجلة الرایة، انترنیت www.raya.com ص ٢ – ٣ – ٥ .

٢- کاروانی شیعری نوێی کوردی: ل ٦٤.

* سالح جەبر یەکێك بوو لە سەرەك وەزیرەکانی چەرخی پاشایەتی لەوەزارەتی ناوخۆ، بڕوانە دیوانی گۆران ل: ٣٩٥.

**رازی.. ناڕازی..**
**عەلی حیجازی**
**((ئەبازی و، بازی**
**بەریشی قازی!))**
**ئەی ساڵح جەبر**
**پڵنگ بی و بەبر**
**نەتماوە زەبر**
**بەس بگرە سەبر..**
**راکە بۆ قەبر** [1]

هەروەها هەندێك لەمەتەلە کوردییەکانیش کە بەشێوەی تەم و مژاوی خراونەتەڕوو، ئەرکی سیاسییان پێ بینراوە وەك لەرۆژنامەی (ژین)دا دەبینرێ: ((کردنەوەی گۆشەی (بۆ زاخاوی میشك) بوو کەجۆرە مەتەڵێکی بەشیعر لەهەر ژمارەیەکدا بلاو ئەکردەوە و لەژمارەی پاشەوەشدا هەڵهێنانەکەی ئەخستەڕوو بەزۆربەی ئەو مەتەلانەی بلاوی ئەکردنەوە ناوەرۆکێکی سیاسییان هەبوو، لەگەل مەبەستی خستنە کاری بیردا هوشیار کردنەوەی خوێنەرەوانیشی لەبارەی سیاسییەوە مەبەست بوو)). [2]

(گۆران) لەمەتەلی (جاسووس) دا دەڵێ:

**ناپاکێکی پێنج پیتییە**
**زیانداری نەریتییە**
**سیان و دوو یەك وەك رووی رەشە**
**بەبرژاندن ئیجگار چەشە**
**لەگەل دەرکەوت (چوار، پێنج) ئەڵێن**
**بەیەکتر و بەو ئەدەن جوێن**
**بەو کێردەی خۆی دای سێ و دوو چوار**

١- دیوانی گۆران : ل ٣٩٥ .
٢- دیوانی گۆران: ل ٥١٥ .



**ورگی ئەدڕن وەك گورگی هار**
**لە (یەك، دوو، چوار) هەڵێ ئەدروون**
**ئەڵێن تۆپی شێری مەلعوون** [1]

بەم شێوەیە دەبینین کە دیارترین ئەرکی شیعر لەو قۆناغەدا (ئەرکی سیاسی) بووە و سەرجەمی شاعیرانی کورد پەیامدارانە ئاوێتەی کێشە سیاسییەکان بوون و زۆربەی دەقەکانیان بەرەو ئەو ئەرکە سیاسییە بردووە...

### ٢- ئەرکی نیشتمانی شیعر:

ئەگەرچی ئەم بابەتە شیعرییە لەگەل شیعری سیاسیدا تێکەلاوی و چوونە ناو یەکتریان لەڕووی ئەرکەوە تیا بەدی دەکرێ، بەلام وەك لە پێشتر ئاماژەمان بۆکرد دەتوانین تاڕادەیەك لەیەکیان جیا بکەینەوە و هەریەکەیان بە سەربەخۆیی باسییان لێوەبکەین.

ئەگەر شیعری نیشتمانی لە ئەدەبی کوردیدا بەشێوازێکی سادە و ساکار دەستی پێ کردبێ ئەوا دوای کۆتایی هاتنی جەنگی یەکەمی جیهانی و لەئاکامی ئەو بارە خراپەی ژیانی میللەتی کورد پێی دا تێ دەپەڕی لە بەتالان بردنی سەر و سامانی و کوشتن و بڕین و پێشێل کردنی مافەکانی، ئەم جۆرە شیعرە لەبەر پێویستی بارودۆخی نەتەوە و نیشتمانی کورد رووی لەفراوانی کردووە و شاعیران بەشیعرەکانیان هەست و خەم و پەژارەی خۆیان و نیشتمان و نەتەوەکەیان دەردەبڕی، هەر بۆیە مەبەست لەشیعری نیشتمانی لێرەدا ئەو شیعرەیە کە ئەرکی دەربڕینی خۆشەویستی و دلسۆزی و خەمی شاعیر بەرامبەر بەو خاك و ولاتەی کەتیایدا لەدایك بووە و ژیاوە لەگەل کۆمەلە کەسانێك کە یەك هەستی ئایین و نەتەوە و داب و نەریتی کۆمەلایەتی بەیەکەوەیان دەبەستێتەوە، دەبینێ: ((شیعری نیشتمانی بۆخۆی خۆشەویستی ئەو نیشتمانە و هەست کردن بەو پێوەندییە دەروونییە ئەگەیەنێت کە هاوولاتی دەبەستێت پێوە و وای لێدەکات خۆشی بوێ، شانازی پێوە بکات و لەپێناوی قوربانی بدات)). [2]

١- دیوانی گۆران: ل ٥٢٣ .
٢- زێوەر ژیان و بەرهەمی، **محمد فاضل مصطفی**، نامەی ماستەر: ل ٧٠.

شـيعری نيـشتمانی لای (زێـوەر) ئـەركی دەربڕينـی خۆشەويـستی و بايـەخ و دلگـيری و نەگۆڕينەوەی شار و نيشتمانەكەی بەهەموو شارە خۆش و گەورەكانی جيهـان بينيـوە: ((زێـوەر كە هەڵگرێكی مەشخەلی ئەو شيعری نيشتمانپەروەرييە بووبێ كەڕابـەرانی بـيری پـێش خـۆی هەليان گرتبوو، ئەوا مەشخەلەكەی دەستی ئەم بەهۆی سەردەمەكەيەوە كڵپە دارتر بووە و وەك شاعيرێك دەستێكی بالای هەبووە لە پێگەياندنی ئەو لقەی شيعری كورديدا كەلە پاش جـەنگی يەكەم بەسەر هەموو گەلا و لقی بچووكی بەشەكەی تردا زال بووە)).[1]

**ئەی وەتەن چەند خۆشەويستی ڕۆحی شيرينی من**

**مەزرەعەی توخمی نيشات و باعيسی ژينی منی**

**گەرچی ئەرزی، هێند بلندی وەختە لای من بچی يە عەرش**

**واسيتەی سەربەستی و ئيجرايی ئاييني منی**

..............................................................

**ئارەزووی فيكری سياحەت ناكەم ئيتر ئەی وەتەن**

**تۆ لەجێگای قاهيرە و تاران و بەرلينی منی**[2]

بەشـێك لـە شـيعری نيـشتمانی ئـەركی ورياكردنـەوەی ڕۆڵـەكانی كـوردی پـێ بينـراوە، بەمەبەستی سوود وەرگرتن لە تاقيكردنەوەی ميللەتانی تر، ديارە ئەمەش بەيەكگرتنی هـەموو چينەكانی گەل و قوربانی دان و بەرگری كردن لەخاك و خۆلی كوردستان دەبێت:

**عيبرەت و دەرسە لەلای ئەهلی نەظەر وەزعی زەمەن**

**دوور نەچين بۆ عەسری كۆن، لەو وەختەدا هەولێ بدەن**

**دەست لەمل يەكتر بكەين بۆ حيفظی گولزاری وەتەن**

**((ديم نموونەی ميللەتی غەيرە كە چۆن خزمەت ئەكەن**

**ظابطان و كاپيتان هەروەك نەفەر پۆل پۆل ئەهات))**

**ئيتيحادێكمان ئەبێ بێ شوبهەيە بێ رەيب و شەك**

---

١- هـ. س :ل ٧١.

٢- ڕ. بانگی كوردستان، ژ (٩)، ١٩٢٢: ل ٦ .



**مير و ئاغا فەرقی نامێنێ لەگەل خەررات و لەك**

**سەيری كەن چۆن ئەجنەبی حوكمی گەياندە سەر فەلەك**

**((بۆ تەرققی مولك و ميللەت جانفيدا بوون يەك بەيەك**

**ئيتيحادە، يەكيەتی ئينسان ئەباتە ڕۆژهەلات))**[1]

لەشيعری نيشتمانی دا ئەركی خەبات و قوربانی دان لـەپێناو پاراسـتنی خـاكی كوردسـتان پيشاندراوە، جگەر خوێن ((خەمخۆرانە و گەشبينانە لەدوا ڕۆژی نيشتمانەكەی دەڕوانێ و بەبير و جەستەی ئاوێتە دەبێت))[2] و دەڵێ

**ئەم جانێ خوە ددن قەت تەركا كوردستانی ناكن**

**لەوا پڕخوەشە دەشت و نوال و چيا و نزار**

**هەمی گول و ياسەمين و بنەفس و ناز و ريحان**[3]

هەندێ جاريش شيعر لە وەسفی ديمەن وسروشتی كوردستان ئەركی دەربڕينـی خۆشەويـستی بۆ نيـشتمانی پـێ بينـراوە هـەروەك (دلـشاد عـەلی) دەلـێ : ((جـوانی سروشـت و وێنـەگرتنی ديمەنەكانی تەنها لايەكی ئەو معادەلەيە بوو كە خۆشەويستيی نيشتمان تەواوكـەری بـوو، واتـە وەسـف كردنـی ديمەنـە ڕەنگينـەكانی كوردسـتان لای زۆربـەی شـاعيرانی ئـەو سـەردەمە و دوابەدواشی بريتی بوو لە خۆشەويـستی كوردسـتان خـۆی وەك نيـشتمانێك، ئەمـە لـە لايـەك، لەلايەكی ترەوە هەر لەو سەردەمە بەدواوە جوانی سروشت لەو سنوورەش تێپەری كـرد كەتـەنها خۆشەويستی شاعيرەكان خۆيان پيشان بدات بەرامبەر كوردستان، بەلكو ئـەمجارەيان ڕێگايـەكی تری گرتە بەر و بوارێكی تری هەلبژارد بۆ هاتنە ناوەوەكەی، ئـەويش هوشـيار كردنـەوەی گـەل بوو بۆ ڕێزگرتن و خۆش ويستنی نيشتمان و قوربانی دان لە پێناوی دا.))[4]

---

١- تەخميسی زيوەر زادە لەسەر غەزەلی (وافی)، ڕ. ئوميدی ئيستيقلال، ژ (١١): ل ٣ — ٤ .

٢- ڕۆڵی عەبدولڕەحيم ڕەحمی هەكاری دنويكرنا هوزانا كورديدا عەدلە جەميل ئەحمەد، نامەی ماستەر، زانكۆيا دهۆك، ٢٠٠٣: ل ٧٨ .

٣- گۆڤاری هاوار، جگەر خوێن، ژ (١٣)، س ١، ١٩٣٢: ل ٣ .

٤- ديلان شاعير و ئازاديخواز، دلشاد عەلی، چ. كۆری زانياری عيراق، بەغدا، ١٩٨١ : ل ٨ .

لای (ئەسیری) دەبینین کە بەوەسف کردن و پیشاندانی  گوڵ و گوڵزار و باخ و چیا و چۆلی کوردستان ئەرکی خۆشەویستی و وەفای بەرامبەر بە نیشتمان بەشیعرەکانی بینیوە:

**بێرە کوردستان عەزیزم گەرتۆ سەیرانت دەوێ**
**بت بەمە قەندیل ئەگەر گوڵزاری کوێستانت دەوێ**
**سەیری ئەو خێلانەکە نیشتوونە داوێنی چیا**
**بابچین بۆ ماڵی کوردێ گەرتۆ خوێشانت دەوێ** [1]

شاعیرێکی کرمانجی ژووروو بەناوی (رکاوی) * لەوەسفی سروشتی کوردستان و دەربڕینی خۆشەویستی بەرامبەر بە نیشتمانەکەی دەڵێ:

**گەلەك گەریام لجهێ کوردا**
**وەکو جهێ وان قەد نینە**
**هەمو چولا هەمو عەردا**
**جوم و جەلال لێ بارینە** [2]

* * *

لەوەسفی شاخ و شوێنەکانی کوردستان و وەسفی ئازایەتی نەتەوەی کورد شاعیر خۆشەویستی و هەستی کوردانەی خۆی دەردەبڕێ هەر لە بواری ئاوێتەکردنی سروشت بەخۆشەویستی نیشتمانەوە (پیرەمێرد) دەڵێ: ((ئەدیبەکانی غەرب و سەرئامەدانی شاعیرانی تورك کەهونەری خۆیان لە نشئە و حلولی طلوع و غروبدا نواندووە ئەگەر دیمەنی رۆژهەڵاتنی گوێژە و ئاوابوونی تاسلوجە و بەرانانیان لەپێش چاو بوایە زۆرتر و جوانتر ئەم دوو لوحەی قدرەتەیان ئەنەخشاند.. أخ بلێم چی ئەم هەموو شاعیرە کوردە لەم خاکە پاکە بەرزەدا هەلکەوتوون تەنها لاسایی زولفی کەمەندی زال و ئەگریجەی رەش و پاوانە و خرخال نەبێ شێوەیەکی خاکەکەی خۆیان نەچەسپاندووەتە دلی دانیشتوانی نیشتمانەوە...)) [3]

١- دیوانی ئەسیری : ل ٢٩ .

* ((شێخ بەشیر شێخ مەحمەد تاهر) لەساڵی (١٩٠٨) لەگوندی بابایێ لەچیای مەقلیبی لەناوچەی قەزا ئیسفنێ لەدایك بووە، رکاوی ئەو هوزانەی لەساڵی (١٩٣٥) وتووە)).

٢- رکاوی و هۆزانەکا سروشتی، وەسفی حسن ردێنی، گ. بەیان، ژ (١٢٣) دار الحریە، ئەیلولی ١٩٨٦: ل ٨٩.

٣- گۆڤاری گەلاوێژ، ژ (١) س ٤، ١٩٤٣: ل٩ .



دیارە لێرەدا مەبەستی (پیرەمێرد) ئەوەیە کە شاعیران چیتر بەدوای وەسفی خەت و خاڵ و یاری شۆخ و شەنگ نەکەون، بەڵکو پێویستە شاعیرانی کورد هەموو کاتێك نیشتمانیان لەبیر بێت و بەوەسفی دیمەن و شاخە جوان و بەرزەکانی کوردستان ئەرکی خۆشەویستی و پیشاندانی دلسۆزی و وەفاداری بەرامبەر بە نیشتمان دەربڕن هەر بۆیە (بێکەس)یش دەڵێ:

**شاخی ڕەنگاوڕەنگی گۆیژە باعیسی کەیف و سروور**
**هەردەمە بەرگێ ئەپۆشێ، گا سپی، گا سەوز و سوور**
**وەسفی قەومی کورد ئەکەی تۆ بەم هەموو رەنگانەوە**
**رەنگی سوورت شاهیدە بۆ کورد کە قەومێکن جەسوور**
**بەرگی بێ گەردو سپیشت دیارە وا هاوار ئەکا**
**قەومی کورد دل ساف و پاکن میللەتێکن بێ قوسوور**
**بەرگی سەوزیشت ئەلێ ئەم خاکە هەر شینابیە**
**پر لە دەغل و دان و کانی، سەر بەرزق و پڕ لەنوور**
**ئەی وەتەن شایانی فەخری واجبە مەدحت بکەم**
**دار و بەردت عەینی گەوهەر، خاك و خۆڵت وەك بلوور** [1]

(بێکەس) لەم شیعرەیدا بەوەسفی دیمەن و ناوهێنانی شاخەکانی کوردستان و بە وێنە گرتن و گواستنەوەی دیمەنەکان کەلە وێنەگرێکی فۆتۆگرافی دەچێت لە پیشاندانی وردی شوێنەکان و سروشتی ناوچە و بەفری سپی سەرشاخەکان و سەوزایی زەوییەکەی لەبەهاردا و ئاوێتە کردنی وەسفەکان بەستایش، ئەرکی دەربڕینی خۆشەویستی نیشتمانی پێ بینراوە.

(زێوەر) لە وەسفی شاری سولەیمانی دا کەتیایدا بەو وەسفە هەست و سۆز و خۆشەویستی خودی شاعیر بەرامبەر بەشارەکەی پیشانداوە و ئەرکی نیشتمانی بەو وەسفە بینیوە:

**((شاری سولەیمانی)) لەلام    وەك ((جەننەتە)) بۆخاس و عام**
**نایدەم بە ((مولکی میسر و شام))    ئاوابێ وەك ((دار السلام))**
**(سەحرای) سەفا بەخشی دلە    داوێنی شاخی پڕ گولە**
**کەیکی لەشاخان ((بلبلە))    شارێکە ((ساحیب ئیحترام))** [2]

١- دیوانی بێ کەس: ل ١٨٣.

٢- دیوانی زێوەر — سۆزی نیشتمان: ل ٨٨ .

بەگشتی لێرەدا دەگەینە ئەو راستییەی کە ئەرکێکی نوێ لەو ئەرکانەی کە شیعری کوردی لەم قۆناغەدا رووی تێ کردووە و گەشەی پێداوە (بابەتی نیشتمانی) بوو کەدیارە ئەمیش وەك بابەتە سیاسییەکە لقێك بووە لەو لقەی ئەدەبی پەیامدار کەشاعیرانی کورد لەو قۆناغەدا بەشێوەیەکی بەرفراوان روویان تێ کردبوو.

### ٣- ئەرکی کۆمەلایەتی شیعر:

لەبیستەکانی سەدەی بیستەم بەولاوە کۆمەلگای کوردەواری لەبەر خراپی و نائارامی بارە سیاسییەکەی لەبارودۆخێکی زۆر خراپ و دواکەوتوودا دەژیان.

شاعیرانی کورد کەرۆلەی ئەم کۆمەلەن و سوورن لەسەر ئەو پەیوەندییە و بەستنەوەیان بەکۆمەلگاکەی خۆیان و خزمەتکردنی کۆمەلەکەیان: ((ئەو پەیوەندییەی شیعر بەکۆمەلەوە دەبەستێتەوە کە لایەنێکی گرنگی کێشەی هەلوێستە لە قۆناغەکانی گۆڕان و پەرەسەندنی شیعردا، چەند بۆچوونێك دروست بووە، یەکێکیان لە چوارچێوە کۆمەلایەتییەکەوە دەڕوانێتە شیعر کە پێویستە رەنگدانەوەیەکی راستەقینەی سەردەمەکەی خۆی بێت، خاوەنی ئەو بیر و رایەش لەو تیۆرەدا خۆیان دەدیبیەوە کەشیعریان بەژیانەوە دەبەستەوە)).[1]

بۆیە لەم قۆناغەدا شاعیران هەریەکەیان بەپێی تێگەیشتن و بیر و باوەڕی خۆیان چالاکانە بایەخیان دەدا بە خستنەڕووی گیروگرفتەکانی کۆمەل ودانانی رێگا چارەسەرییەکی دروستی و وەك خەمخۆری راستەقینەی گەل و کۆمەل بۆ ئەم کێشانە بەئەرکی سەرشانی خۆیان دەزانی و بەپێی توانا و دەسەلاتیان گوزارشتیان لەو کێشانە کردووە و دەریان بڕیوە.

بەم پێیە ئەرکی کۆمەلایەتی شیعر بریتییە لە ((وێنە گرتنی ئێش و ئازاری خەلکەکە بەگشتی کە هەموو میللەت پێی کاریگەر دەبن و هەروەها بریتییە لە شۆڕبوونەوەی شاعیر بۆ ناخ و قولایی کۆمەلگاکەی کەتیایدا دەبێتە نوێنەری هیواکان و ئازار و هەستەکانی...))[2]

کەوابێ لەم ئەرکەدا شاعیر خۆی و بابەتە شیعرییەکانی دەخاتە گەڕ لە پێناو خزمەت و سوود گەیاندن بەژیان و کۆمەل، دیارە ئەم بابەتە شیعرییانەی کە شاعیر دەیانگرێتە خۆی دەکەونە ژێر کاریگەری کۆمەل و کاریگەریشی لە سەر خزمەتکردن و پێشکەوتنی

١- هەلوێست لەشیعری کوردیدا، قومری سەعید عەزیز، نامەی دکتۆرا : ل ٢٢ .

٢- نقد الشعر العربي الحديث في العراق : ص ١٥٨ — ١٦٠.



کۆمەلگاکەی لە هەموو بوارەکانی ژیانی نەتەوەکەی دەبێت، بابەتەکانیش بریتین لە دەستنیشانکردنی کێشە و گیروگرفتە کۆمەلایەتییەکانی وەك: ململانێی چینەکان و خستنەڕووی ئەو داب و نەریت و فاکتەرانەی کەدەبنە کۆسپ لە رێگای پێشکەوتنی کۆمەلگا و هەروەها باسکردن لە بابەتی وەك خوێندن و بەدەست هێنانی زانست و زانیاری و کێشەی ئافرەت و کارکردن...هتد.

ئەگەرچی ئەم جۆرە شیعرە بۆ سەردەمێکی کۆنی ئەدەبیاتی کوردی دەگەڕێتەوە بەلام بەو فراوانی و بەو شێوەیەی ئەو قۆناغەی کە مەبەستمانە باسی لێوە بکەین (١٩٢٠ — ١٩٥٨) نەبووە کە ژمارەیەکی زۆر لە شاعیران بەبابەتە شیعرەکانیان پەنجە لەسەر زامەکانی کۆمەل دابنێن و بەدوای چارەسەری دروستیش بۆیان بگەڕێن.

لەو قۆناغەدا شیعری کۆمەلایەتی ئەرکی خۆشەویستی نیشتمان و وشیار کردنەوەی نیشتمانپەروەرانی پێ بینراوە، بەوەی کە رۆلەی دلسۆز ئەو کەسەیە کە دریغی ناکا لەخزمەتکردنی ولات بەسەروسامانی بەتایبەتی ئەو کەسانەی کەتوانای ماددییان باشە و دەتوانن ولات خزمەت بکەن و پێشی بخەن بەکردنەوەی قوتابخانە و بایەخدان بەزانست و زانیاری:

**هیممەتی ئەربابی غیرەت بێستون ئیمحادەکا**
**ئەو کەسەی صاحب حەمیەت بێ وەتەن ئەحیادەکا**
**یەعنی ئەولادی وەتەن موحتاجی عیلم و سەنعەتە**
**گەر وەتەن پەروەربێ شەخسێ مەکتەبێ ئینشادەکا**
**نووری عیلم و مەعریفەت واشەرق و غەربی گرتەوە**
**قەومی ئێمە تازە تەعلیمی خەت و ئیملا دەکا**[1]

هەروەها شیعری کۆمەلایەتی رۆلی بەرچاوی هەبووە لە خستنەڕووی بایەخ و پێویستی و بەستنەوەی زانست و سیاسەت بەیەکترەوە بۆ ئەو رۆژگارەی کە دوو کێشەی گرنگی میللەت بوون و ببوونە هۆکاری ژێر دەستی و دواکەوتنی باری شارستانی و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری و نەبوونی ئارامی لەکوردستان، بۆیە (مستەفا شەوقی) لە وشیار کردنەوەی میللەتی کورد و بانگەوازکردنیان بۆ بەدوا چوونی زانست و سیاسەت، دەلێ:

١- ر. بانگی کوردستان، رەفیق حلمی، ژ (٢)، ١٩٢٢: ل ٣ .

**بەبێ عیلم و سیاسەت ئەی بەقوربان**
**مەحاڵە ئەندەر، مەحاڵە ژینی کوردان** [1]

دیارە لەو سەردەمەدا بەشێکی زۆری میللەت نەخوێندەوار بوون و گرنگییان بەخوێندن و بەدەست هێنانی زانست و زانیاری نەداوە و هەستیان بە بایەخی ئەم لایەنە و رۆڵی لەپێشخستنی باری شارستانی و رۆشنبیری و ئابووری و سیاسی و هەروەها هەموو لایەن و کونجێکی ژیان نەکردووە، بۆیە فەرامۆشیان کردووە: ((شاعیرانی کورد کێشەی نەخوێندەوارییان خستووەتە پاڵ هەژاری و دواکەوتوویی کۆمەڵەوە، بانگەوازی خوێندەواری بابەتێکی نوێیە لە شیعری قۆناغەکە... شاعیرانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لەجیاتی ئەوەی بابەتەکانی (دڵداری و ستایش و وەسف و داشۆرین و...هتد) بکەن بە بابەتی سەرەکی شیعرەکانیان بەپێچەوانەی شاعیرانی قۆناغەکانی پێشووتر، کێشە کۆمەڵایەتییەکانیان کردووە بە بابەتی سەرەکی شیعر و بانگەوازی خوێندەواری و زانستیان دەکرد.)) [2]

بۆیە (ئەحمەد موختار جاف) زوو هەستی بەو لایەنە بایەخدارە کردووە و لە شیعرەکانیدا ئەرکی هاندانی میللەتی کوردی بۆ خوێندن بینیوە، چونکە بە بۆچوونی شاعیر میللەت بەخوێندەواری وشیار دەبێتەوە و دەزانێت چۆن بەرگری لەخاك و نەتەوەکەی بکات:

بخوێنە چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئانو زەمانێ عەینی قەڵغان و سوپەرتانە [3]

هەر لەچوارچێوەی ئەو بایەخدانەی شاعیران بە خوێندن و رۆشنبیری، شیعری فێرکردنیش بە شێوەیەکی نوێ هاتە ئاراوە، ئەم جۆرە شیعرەش کەلای (ئەحمەدی خانی و شێخ مارفی نودێ)یش دەبینرێ تیایاندا پەند و ئامۆژگاری و هەواڵ و زانیاری بەدی دەکرێت.

لەم قۆناغەشدا شیعری فێرکردن لەژێر باڵی قوتابخانەکاندا پەرەی سەند و لەبواری فێرکردنی قوتابییاندا شاعیرانی قۆناغەکە بایەخێکی دیاریان پێ داوە.

١- ر. بانگی کوردستان، ژ (١)، ١٩٢٢: ل ٣ .

٢- سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی، نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، ئازاد عەبدولواحید کەریم، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ : ل ١٩٦ .

٣- دیوانی ئەحمەد موختار جاف: ل ٣٣ .



لەشیعری (تۆپی پێ) زێوەر دەیەوێ منداڵی کورد لەپاڵ فێرکردن و خۆشەویستی وەرزش و یاری فێری سوودی وەرزشیان بکات و هانیان بدات بۆ وەرزش کردن، بەمەش شاعیرانی ئەم قۆناغە بە شیعرەکانیان کەلێنێکیان لەبواری پەروەردە و وەرزش و بایەخیان لەگەشەکردنی لەش و ئارامی دەروون، پڕکردۆتەوە: ((زێوەر و بێکەس و بەختیار زێوەر ئەو سێیانە بەناوی (کەششافە و تۆپەکەم)ە وەلە و بوارەدا شیعریان بۆ منداڵان نووسیوە. وادیارە هەرسێکیان هەستیان بەگرنگی گەمە و یاریکردنی قوتابیان کردووە، هەر بەو هۆنراوانەیان منداڵانیان بۆ پەروەردەی وەزرشی هەڵناون. رەنگە ئەوانە ئەوەیان زانیبێ کەلەسەدەی نۆزدەهەمەوە بۆ زانایانی پەروەردە دەرکەوت کە وەرزش کارێکی گەورەی لەسەر پەروەردەبوونی راست و دروستی منداڵان هەیە)). [1]

**ئەی تۆپەکە فووت بۆڵەکە — من دێم لەدەست رامەکە**
**تۆ تۆپی یاری کردنی — وەك کولەکەی رۆحی منی**
**وەختێ کەچوویتە ئاسمان — بانگ کە لەگەڵ من یەك زبان** [2]

هەروەها شیعری فێرکردن ئەرکە کۆمەڵایەتییەکەی بەفێرکردنی پاداشت و وەفاداری و رێز و خۆشەویستی بەرامبەر بەو رەنجەی کەدایك بۆ منداڵەکەی دەیدا، پیشانداوە: ((لە سرد و شیعرە کۆمەڵایەتییەکانی بێکەسدا — ئەوانەی کە بۆ منداڵانی داناون — بەئاشکرا چەمکە کۆمەڵایەتییەکە — لەناو شیعرەکانیدا دەخوێندرێتەوە، پاداشت دانەوەی دایك و هەروەزی دوو فاکتەری گرنگن بۆ سەرفرازی تاك و سەرکەوتنی کۆمەڵ)). [3]

**منالێکی ساوابووم**
**کەی وەك ئێستا کەوا بووم**
**دایکم بەخێوی کردم**
**ئەو نەبوایە ئەمردم** [4]

١- ئەدەبی منداڵانی کورد، حەمەکەریم هەورامی، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥: ل ٢٠٢ — ٢٠٣ .

٢- دیوانی زێوەر، ئامادەکردنی مەحموود زێوەر، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣: ل ١٩٤ .

٣- ئەدەبی منداڵانی کورد، حەمەکەریم هەورامی، ل ١٩٤ — ١٩٥ .

٤- دیوانی بێکەس: ل ١٥٦ .

لەبارەی فێرکردنی هەرەوەزیش بێکەس منداڵانی کورد هانددا بۆ ئەوەی کاربکەن و لە کارەکانیشیان هاوکاری تاکەکانی تری ناو کۆمەڵ بکەن و یارمەتی یەکتری بدەن:

**دارا لەمە عیبرەتی گرت**
**پەندێکی باشی لێ وەرگرت**
**وتی هەرکارێ گرانە**
**بەهەرەوەزی ئاسانە** [1]

لای (زێوەر)یش ئەرکی فێرکردنی ناوی ئەو وڵاتانەی کە دراوسێ عیراقن و دەکەونە سەر سنوور، بۆ منداڵانی کورد دەبینێ: ((زێوەر شاعیری زانست پەروەر بۆ بەدی هێنانی شۆڕشی رۆشنبیری بەشێکی زۆری بەرهەمی خۆی بۆ پەروەردە کردنی نەوەی تازە تەرخان کردووە، بەو پێیە زۆرتری ناوەڕۆکی شیعری ئەو بریتی دەبێ لەهەستی نیشتمانی و سروود و بابەتی خوێندن و پەروەردەکردن)) [2]

**سنووری ((عیراق شرقی ئێرانە))    ((غربی سووریە)) هەر بیابانە**
**هەموو شمالی هی: (تورکیایە)    (شمالی شرقی ئێرانی) تیایە**
**(جنوبی خلیج ئەمارەتی کوێت)**
**(سەحرای نەجدیشە معلوم) ببێ لێت !..** [3]

هەروەها لە شیعری منداڵان دا شیعری فێرکردن ئەرکی ناساندنی ناسنامەی نەتەوەیی بەمنداڵانی کورد بینیوە: ((بێکەس راستەوخۆ منداڵان خۆیان بەخۆیان دەناسێنێ کە کوردن و خاوەن نیشتمانن کەزێدی باو باپیرانیانە وە دەشێ هەوڵ بدەن رزگاری بکەن، تا بەئازادی بژین. نیشتمانیان وا لا شیرین دەکات کەلە پێناوی رزگارکردنیدا خۆیان جانفیدا بکەن.)) [4]

١- هـ. س : ل ١٦٥ .
٢- بەختیار زیوەر (ژیان و بەرهەمی) د. عیزەدین مستەفا رەسوول، گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژ (٢٢)، ١٩٧٨ : ل ٤١ .
٣- دیوانی زێوەر، سۆزی نیشتمان: ل ١٠٢ .
٤- ئەدەبی منداڵانی کورد: ل ١٩٢ .



**تۆ چیت؟ من کوردم    نەتەوەی کوردم**
**خۆ ترسنۆك نیت    حاشا نەبەردم**
**چی تۆی لەناو برد    دوودڵی و نیفاق**
**چۆن رزگار ئەبی    هەر بەئیتتفاق** [1]

هەروەها لە فێرکردن و هاندانی منداڵی کورد بۆ خوێندن و فێربوون و وەرگرتنی زانست و زانیاری کە کاردەکاتە سەر پێشکەوتنی وڵات و پیشاندانی رێگای خۆشەویستی و بەرگری کردن لەنیشتمان بە نەوەی داهاتووی کورد، (جەلادەت بەدرخان) دەڵێ:

**ئەز بخوینم خوەندا ببم**
**مەزن ببم، ب ناڤ، و دەنگ**
**ئەز هەلگرم، تۆپ و تفەنگ** [2]

هەر لەو سەردەمەدا باری دواکەوتوویی کۆمەڵ ئافرەتی کوردی راستەوخۆ خستبووە ژێر باڵی چەوساندنەوە و زوڵم و ستەم لێ کردنەوە، هەربۆیە کێشەی ئافرەتیش ((یەکێکە لەو کێشە کۆمەڵایەتییانەی دەمێکە سەرنجی روناکبیر و شاعیرانی بەلای خۆیدا راکێشاوە هەر کەسەو بەگوێرەی تێگەیشتن و هەل و مەرجی سەردەمەکەی خۆی، چارەسەری بۆ دەدۆزێتەوە)) [3]

جابۆیە شیعری کۆمەڵایەتی لەو رۆژگارەدا ئەرکی هاندانی ئافرەتی کوردی بۆ داواکردنی مافەکانی لە سەربەخۆیی و ئازادی رادەبڕین و چوونە ناوخەباتی ژیان و تێکۆشان شان بەشانی پیاو لەمەیدانی ژیاندا، بینیوە، (بێکەس) ناوی (نەسرین) وەکو رەمزێك بۆ بانگەشەی کچی کورد بەکاردێنێ و پێی دەڵێ:

**نەسرین دەمێکە داخت لەدڵمە**

١- دیوانی بێکەس: ل ١٥٣ .
٢- جەلادەت بەدرخان و شیعر، ئازاد عەبدولعەزیز مزووری، چاپخانا (حاجی هاشم)، هەولێر، ٢٠٠٦ : ل ٨٢.
٣- ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی لە شیعری هێمن، نامەی ماستەر،: ل ١٠٠ .

گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە
وامن پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە
هەستە تێکۆشە تاخوێنت گەرمە
سەپۆش فڕێدە چ وادەی شەرمە [1]

(هێمن)یش لەسەر زاری کوڕی کورد، داوا لەکچی کورد دەکا کە هاوکاری بکات بۆ بەدەست هێنانی مافەکانی خۆی، تابەیەکەوە دوژمنی نیشتمان و نەتەوە بەدەرنێن، دەڵێ:

دێدە گیان کچی کوردی ژیکەلە
داوێنی پاکت دوور بێ لەپەلە
کچی هەموو کەس ئیمڕۆ سەربەستە
هەر هەقی کچی کوردە پێ پەستە
بپسێنە لەپێ تۆ زنجیر و کۆت
دێدەگیان بدە یاری برای خۆت
لە گوێن (ژاندارک) هەستە وەك مەردان
دوژمن وەدەرنێ لەخاکی کوردان [2]

(مەلا مەحمەدی کۆیی) لەبایەخ و بەرزی پلە و پایەی تێگەیشتن و زیرەکی ژن، وای بۆ چووە ژن کە دایکی رۆلە و نەوەکانی دوارۆژمانە ئەگەر چاك و تێگەیشتوو بێت ئەوا رۆڵەی چاکی لێ دەکەوێتەوە و ئەگەر ژنەکە سیفەتی باشی نەبێت، ئەوا پەروەردەی نەوەکانی بەخراپ و زیان دەشکێتەوە سەری و رۆلەی خراپ پێدەگەیەنێت:

ژن زینەتی دونیایە ئامانەتی خودایە
حەبیبی مستەفایە قەلاتن لە بۆمێردان
ژن ئەگەر بەحورمەت بێ بێ زیللەت و زەحمەت بی
بەتەربیە و خزمەت بێ دل گوشاد و لێو خەندان
کوڕی دەبێ وەکو شێر عاقل و دانا و دلێر

---

١- دیوانی بێکەس: ل ٦٦ .

٢- دیوانی هێمن: ل ٣١٢ .



بەدل غەنی و بەچاو تێر سەردار و مەردی مەیدان
ژنێکی دەربەدەر بێ دل پر غەم و کەدەربێ
رەزیل و دەست بەسەربێ وەك محبوس لەناو زیندان
دەبێ ئەولادی کووبێ رەوت و هەم بێ رووبێ
مێشکی وەکو کدوبێ ترسەنۆك وەك یهودان
زەرد و زەعیف و باریك گوێ گران و چاوتاریك
لووت بەچلم و دەم بەلیك سارد و سوك و سەرگەردان
دەرحەق ژنان بێ باکن بۆیە بێ داکی چاکن
سەیری حالی خۆ ناکەن وەك دڕکن لەناوعەردان
تەربیە لەلای داکە داك چابی ئەولاد چاکە
باب لە اصلا بێ باکە فەرقەکی ناکا چەندان [1]

هەر لەم بوارەدا شاعیرانی قۆناغەکە ئەوەیان لا روون بووە کە مادام خوێندن چرا و رێگا رووناك کەرەوەی ژیانە و، بۆ ئەوەی ئافرەتی کورد رۆشنبیر و رووناکبیر بێت و بەتەواوی بێتە ریزی ئافرەتانی جیهان، پێویستە لەسەری بەدوای خوێندەواری و زانست و زانیاری دا بگەڕێ دیارە کەئەمەش ئەرکێکی دوولایەنەی کێشە کۆمەڵایەتییەکانە کەدەبێت بەدوای چارەسەری بۆی بگەڕێن.

پیرەمێرد وەکو رۆشنبیرێکی سەدەی بیستەم ئاگاداری بایەخ و نرخی خوێندەواری و رۆلی لە پێشەکەوتنی کۆمەل بووە، بۆیە روو لە کچان دەکا و هانیان دەدا بۆ ئەوەی رووبکەنە خوێندن و قوتابخانەکان و خۆیان بێبەش نەکەن لەم بوارە بەنرخەدا: ((هاواری خوێندەواری پیرەمێرد لەناوەڕاستی سالانی بیستدا هەر بۆ پیاوان و کوڕان نییە، بەلکو کچانیش ئەگرێتەوە، بەمە دوولایەنی بیری تەنویریمان پیشان ئەدا، یەکەم: حەز بەخوێندەواری کردن. دووەم: کۆشش بۆ هاتنە مەیدان و بەرەو چوون بەکی رۆیشتنی ژن)).[2]

---

١- دیاری مەلا مەحمەدی کۆیی، چاپی چوارەمین، چاپخانەی هەولێر، ١٩٦٩: ل ٤١ — ٤٢ .

٢- ئەدەبیاتی نوێی کوردی: ل ٥٩ .

**ئەی کچینە وەرنە مەکتەب**
**ئێوە تەسکینی دلن**
**زینەتی دیباجەی ئەدەب**
**تازە گوڵخونچەی گوڵن**
**ئێمە تازە تێگەیشتووین**
**دایکی چاکی خوێندەوار**
**نەوەی وای بۆ بەجێ هێشتووین**
**میللەتی پێ بێتەکار** [1]

بەبۆچوونی (جگەرخوێن)یش کچی کورد بەخوێندەواری و فێربوونی زانست و زانیاری دەتوانێ ئازادی و سەربەخۆیی خۆی وەربگرێ:

**ئەی کچێ رابە بخوینە داتو سەبەرست هەر بژی**
**زوو ژ خەو تو سەرهلینە بەس بمینە بێ مژی** [2]

لەپاڵ ئەو ئەرکە کۆمەڵایەتییانەی کە شیعر بایەخی پێدابوون  شیعری کۆمەڵایەتی ئەرکێکی تری پێ بینراوە، کە دەربڕینی کێشەیەکی تری بایەخداری کۆمەڵگای کوردەوارییە کەباسکردنەلە کارکردن و بایەخی لەبنیات نانی شارستانییەت و پێشکەوتنی باری ئابووری وڵات.

بۆ ئەم مەبەستە شیعر لای (دڵدار) ئەرکی هاندانی جەماوەر بۆ کارکردن و خەبات لە پێناوی بەردەوامی ژیان و بەدەست هێنانی بژێوی و ئاوەدان کردنەوەی نیشتمان و زیادکردنی بەرهەم، دەبینێ:

**دل بە دوو ئەفسانە کەوت و وای ئەزانی وائەبێ**
**ئیشی دنیا رەنجی پێ ناوێ بەخۆی کۆتا ئەبێ**
**نەی دەزانی ئەو بە (ئارەق) داری ئومێد ئاوبدا**
**گەر بەخوێن پەینی بکا ئەوسا سەمەر پەیدا ئەبێ**

١- پیرەمێرد، ئومێد ئاشنا، بەرگی یەکەم: ل ٣٦٨.
٢- رۆلی عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری د نویکرنا هوزانا کوردیدا، نامەی ماستەر: ل ٧٩ .



.........................................................

**مردنە ژینت بەبێ کاری، لەسستی لابدە**
**هەر بەرەنجی لاوی وەك تۆ نیشتمان ئاوا دەبێ** [1]

لای (قانع)یش شیعر ئەرکی پیشاندان و هاندانی هەموو تاکێکی کۆمەڵ بەهەموو چین و رەگەزێکیەوە بۆ چاککردنی باری گوزەرانی خێزان و لایەنی ئابووری کۆمەڵگا، دەبینێ:

**برام عەیبی نییە شوانی و سەپانی**
**ئەبەخشن فەخر و شانازی بە ئینسان** [2]

هەروەها دەڵێ:

**فەرقی نییە نێر و مێ        هەرچی دانیشتووە لەدێ**
**هەموو خەریك فرمانن        بەدەس هێنانی نانن** [3]

ئەرکێکی تری کۆمەڵایەتی کەلە شیعری کوردی ئەو قۆناغە خراوەتەڕوو کێشە و جیاوازی چینایەتی بووە، دیارە ئەم کێشەیە لەکۆنەوە شاعیرانی کوردی بۆ لای خۆی راکێشاوە، لەبەر ئەوەی شاعیران هەر زوو هەستیان بەو کێشەیە کردووە و بەشیعرەکانیان لایەنگری خۆیان بۆ چینی چەوساوە و زوڵم لێکراوەکان پیشانداوە، چونکە جیاوازییە چینایەتییەکە و کێشەی ئاغا (دەرەبەگ)و جووتیار، دەولەمەند و هەژار،...هتد) زۆر جار بۆتە کۆسپ لەرێگەی پێشکەوتنی کۆمەل و باری ئابووری و رۆشنبیری و...

(گۆران) لەدەقی شیعری (نالەی بێکار)دا وێنەی ئەو جووتیارەمان بۆ دەکێشێ کە چۆن لەژیانیدا دوای خزمەتێکی زۆری ئاغای زۆردار، کەچی ئاغا  بێ وەفاش لە پاداشتی ئەوەدا بێ ئەوەی دەستی هیچ یارمەتییەکی بۆ درێژ کات فرێی دەداتە دەرەوە، (گۆران) لێرەدا ئەو

١- دیوانی دلدار: ل ١٧٦ .
٢- دیوانی قانع: ل ٢٠ .
٣- دیوانی قانع: ل ٣٧٥ .

راستییەمان بۆ دەخاتە بەردەست کەچۆن ئەو جووتیارە لە کاتی برسێتی و نەخۆشی دا لەبرای جووتیاری هاوژین و هاوخەباتی بەولاوە کەسێکی تر یارمەتی نادات، دیارە لێرەدا مەبەست و ئامانج لەو دەقە شیعرییە دا ئەوەیە بوترێ کە پێویستە چینی جووتیار و چەوساوەکان یەکبگرن و دۆست و دوژمنی خۆیان لێك جیا بکەنەوە:

**((نامە خوا)) و ((ئافەرین)) سەری لێ شێوانم**
**دلسۆزی بۆ ئاغا ئەوەندەی رەتانم**
**تا رادەی ئەوپەڕی شەکەتیی گەیانم**
**پەکم کەوت.. نەخۆشی لەشی تێك شکاندم !**
**بەرگوێم کەوت باوکی کوڕ (نەك ئێستا، هی جاران !)**
**قیڕاندی: بۆ نایبەن فڕێی دەن لە کۆڵان !**

گۆران جگە لە پیشاندای جیاوازی چینایەتی لەنێوان ئاغا و چینی خوارووی رەش و رووتی کۆمەل و چەوساندنەوە و بێ وەفایی چینی ئاغا و دەرەبەگ بەرامبەر بە چینی هەژار و جووتیارانی بێ دەسەڵات کێشە و نرخی ئیش کردن بۆ ئادەمیزاد و گرنگی لە ژیاندا دەخاتەڕوو:

..........................................................

**فرمانێ، ئەی کۆمەل! فرمانێ.. فرمانێ..**
**بۆ دەردی بێ کاری چارەیەك دەرمانێ**
**زۆرشەرمە لەچەرخی بیستەما ئینسانێ**
**بێ ئیش بێ و سکی خۆی هەل لووشێ بۆ نانێ !** [1]

هەر لەبارەی چەوسانەوەی مرۆڤی بێ دەسەڵات و فرت و فێل و درۆی شێخ و سۆفی، وەبەکارهێنانی ئایینی ئیسلام بۆ مەبەست و بەرژەوەندی کەسی خۆیان کە دەبێتە هۆی دواکەوتنی کۆمەڵگا و ژێردەستی میللەتەکەمان (جگەر خوێن) دەڵێ :

**کنجێ ل شێخ چوخ و قوماش**
**کنجێ ل سۆفی چادرە**
**ئاغا ب دەه گوندێ خوەڤە**
**باوەڕ دکە کەی خوسرەوە**
**تالانکەر و دز و کەلەش**

---

١- دیوانی گۆران: ل ١٩٩ — ٢٠٠ .



**وی دایە سە رێچا گورە**
**حالی مە کورمانجان ئەڤە**
**ئەم دێ چلۆ سەربەست بژین**
**هەرچی کو چوویە گوه مەدێ**
**سلاڤ ل سفرە حازرە**
**سەیدایێ راست و رهنییە** [1]

هەروەها لای (مەلا محەمەدی کۆیی)یش لە شیعرە کۆمەڵایەتییەکانیدا ئەرکی دەربڕینی فرت و فێلی شێخە کوردەکان و چوونە ناو ئایین بۆ مەبەستی خزمەتکردنی بەرژەوەندی خۆیان لەپشت پەردەی ئاینەوە بینیوە و دەڵێ:

**تۆی شێخی ئەهلی سنە و جەماعەت**
**بەو هەموو فێل و کەید و طەماعەت**
**هەروەکو پاپی بەهەشت دەفرۆشی**
**وەی قوڕت بەسەر گەلی بێ هۆشی**
**بوویە سنییە تا بلێن قطبە**
**خاوەنی پایە و صاحبی روتبە**

..........................................................

**سنی زۆر پاکن نەوەك وەکو تۆن**
**بەدرۆ و دەلەسە مالی یەك ناخۆن** [2]

هەر لەم بوارەدا و لەو قۆناغەدا (کامەران موکری)یش ئەرکی کۆمەڵایەتی بە شیعرەکانی بینیوە، بەتایبەتی لە هۆنراوەی ((کچەکەی بەرتیلە))دا کەباس لە جیاوازی چینایەتی لەڕووی دەولەمەندی و هەژاری نەزانی و لایەنی رەوشتی مرۆڤایەتی دەکات و دەڵێ:

((لەساڵی (١٩٤٧)دا، کە تازە پێم ئەنایە باخی گەنجێتییەوە چووم بۆ (ناو نووسین — احصاء النفوس) وە لەدێیەك لەدێکانی کوردستان ئەم رووداوەم دی...)) [3]

سەرەتای هۆنراوەکە بەوەسفی دێ یەکە ئینجا کۆشکی رازاوەی ئاغا دەست پێ دەکات:

**لامان دایە، دێیەك بچووك**

---

١- گۆڤاری هاوار، ژ (٥١)، ١٩٤٢: ل ٤ .

٢- دیاری مەلا مەحمەدی کۆیی: ل ٦٣ — ٦٤ .

٣- دیوانی کامەران: ل ١٣١ .

باخی رازاوەی، وەك بووك
مالی ئاغا بەگەچ سپی
داوێنی گوڵی پەمەیی
ئەمجارە دێتە سەر باسی چینی رەش و رووتەکەی دێ:
چوومە زنجێك تاریك و تەنگ
دانیشتم مەلوول و بێ دەنگ
دل تەنگ بووم بۆ کۆمەلێ گیان
کەبەشیان خەفەتە، گریان

کامەران لەباسی پارانەوەی پیرەژنێك بۆ ناونووسین بەلکو شەکر و چایان بدرێتێ بەلام دیارە رۆژگاری ئەوکات (بەرتیل) باوی هەبووە و کاری باش بە بەرتیل بەرێوە چووە، پیرەژنیش هیچی نەبووە وەکو (بەرتیل) بیدات، بۆیە بریار دەدات یەکێك لە کچەکانی بکاتە بەرتیل:

ئەلێ (ئەی شۆخەسوار) توخوا
بەرتیلیش نەبم هەر بمبە
لەم ژیانە رزگارم کە [1]

(دلدار)یش لە خستنەرووی کێشەی واقیعی جووتیاری کورد و بەتالان بردنی سەروسامان و بەرهەمە کشتوکالییەکەی و زۆرداری و رووتاندنەوە و چەوساندنەوەی ئاغای خوێنمژ بەرامبەر بەخەڵکی هەژاری لادێ، (کەریم شارەزا) لەبارەی ئەو شیعرەوە دەڵێ : ((ئەم هەڵبەستەی دڵدار شیعرێکی ریالیزمی فۆتۆگرافییە، وەك بڵێی کامیراییێکی گرتۆتە دەست و واقیعی رەنگ و رووی ژیانی ((لالۆ))ی جووتیاری هەژاری کلۆڵی بۆ گرتووین)).[2]
سێ مانگام هەبوو بەتالانی برد
منالی هێشم، بەبێ ماست و دۆ

١- دیوانی کامەران: ل ١٣١ — ١٣٢ — ١٣٣ .
٢- دلدار و شیعری ریالیزم، کەریم شارەزا، گۆڤاری نووسەری کورد، ژ (٢) ئابی ١٩٨٣: ل ١٥ .



هەندەی پێ نەچوو، عەزەی سالح ئاغا
لەسەری کردم بۆ حیسەی تاپۆ
چوومە (خراپە) ووتم ئاغا گیان
ملکم هین خۆمە قەیدن لەتاپۆ
پێی ووتم (پیرەی سمێل کلکە سە)
یاتاپۆ بدە، یا بارکە برۆ
..............................................
ئەوا چل سالە زەوی ئەکێلم
فەللاحی ئەکەم هەتاکو ئیمرۆ
نرخی عارەقەی روونی ماندووییم
تیکە نانێکە، چەنان؟ نانەجۆ
ئەویش بە بێ دۆ... [1]

بەگشتی شاعیرانی ئەم قۆناغە ئامۆژگاریکەرێکی دڵسۆزی گەل بوون، دیارە ئامۆژگاریش لەم قۆناغەدا بەشێك بووە لە ئەرکی ئەدەبی (زێوەر) ئەرکی ئامۆژگاری و خستنەرووی هەندێ داب و نەریت و خوی دواکەوتووی کۆمەل و دوورکەوتنەوە لەو رەوشتە خراپانە و گۆرینەوەی و لە شوێن دانانی هەلس وکەوتی بەرز و چاك کەلەگەل داب و نەریتی کۆمەلگای کوردەواری دەگونجێت، بینیوە. دیارە (زێوەر) وەکو مامۆستایەك لەرێگەی شیعر و بەپەند و ئامۆژگارییەکانییەوە خزمەتی هاونیشتمانەکانی کوردی کردووە:
خۆت سووك مەکە بە غائیلەی سەد مەرامەوە
تاماوی رابوێرە بە ((نامووس)) و نامەوە
خۆت رۆستەمی زەمانەبە خۆت ((حاتەمی)) جیهان
فەخرت نەبێ بە (باب) و بە ((خال)) و بەمامەوە [2]
لەباسی دەولەمەندی و هەژاریش دەڵێ:
مەلێ من دەولەمەندم ئەو (فەقیرە)

١- دیوانی دلدار: ل ٢١٢ — ٢١٣ .
٢- دیوانی زێوەر، سۆزی نیشتمان : ل ٢٠ .

**مەلێ ئەو هیچە، من باوکم ((ئەمیرە))**

**هونەر ئەمرۆ بە ((سەعی و عیلم و دینە))**

**حەسادەت کاری — شەیتانی لەعینە** [1]

(قانع)یش لە ئامۆژگاری و هاندانی باوکان بۆ ئەوەی رۆڵەکانیان بخوێنن، لەبەر ئەوەی کەمرۆڤی خوێندەوار مرۆڤێکی رۆشنفکر و گەشبینە بۆ ژیان و دوارۆژ، بەڵام مرۆڤی نەزان و نەخوێندەوار بەپێچەوانەوە هەمیشە بیری بۆ تەمبەڵی و پشت بەستن بە خەڵکانی تر و هەروەها بۆ شتی خراپ دەچێت:

**تۆ کە بابی کوڕەکەت عیلمێ بخوێنێ چاکە**

**عالەمی جەهل لەلای من بەمەسەل خاشاکە**

**وەرە بنواڕە لەکوردا ئەوە واعیلمی نییە**

**حاملی کوولەکە و زەرگ و دەف و مەشاکە**

...................................................................

**ئەوی عیلمی هەیە دایم بەدەماخ و شەوقە**

**ئەوی عیلمی نییە چاوی بەئەبەد نمناکە** [2]

(بێکەس) لەئامۆژگاری هاوولاتی کورد بۆ ئەوەی لە زیانی یاری قومار کردن دوورکەونەوە کە یەکێکە لەهۆکارەکانی خراپی باری ئابووری و رۆشنبیری و شارستانی لەناو کۆمەڵگا، دەڵێ:

**بەڵێ دریغا ئەم قەومی کوردە**

**بۆشتی بێ فەڕ بەدەست و بردە**

**نیفاق و درۆ و جاسوسی و قومار**

**تێیا ماهیرن وەکو دانی مار**

......................................

**لێکی بەرەوە چاکی بزانە**

**ئەمە ئەحوالی موجتەمەعمانە** [3]

---

١- هـ. س : ٤٠ — ٤١ .

٢- دیوانی قانع: ل ٢٦١ .

٣- دیوانی بێکەس : ل ٧٠ — ٧١ .



لای پیرەمێردیش لە دەقە شیعرەکەی (مزگەوتی گەورەی سلێمانی) ئەرکی ئامۆژگاری بەرەخنەگرتن و باسکردنی پیسی مزگەوت و شوێنە پیرۆزەکانی شار کە دیاردەیەکی ناشیرین و نابەجێییە و دیارە کەپاك و خاوێنیش دیاردەیەکی شارستانی و مەدەنییە دەڵێ:

**بۆ ئەو کەسانەی، دڵیان وریایە**

**نووری کاك ئەحمەد، زۆر ئاشکرایە**

**لەحەوز بەرەو خوار، تا بڵێی خوارە**

**گەرباوەڕ ناکەی وەرە بنواڕە**

**حەوزەگەورەکەی کە دەڵێن پاکە**

**پڕپەلە قەوزە، هەروەك شیاکە** [1]

(بێکەس) لە ئامۆژگاری کۆمەڵگا و میللەتی کورد بۆ کارکردن و دوورکەوتنەوە لە (عەیبە) و لەخۆبایی بوون، کە هۆکارەکەشی بۆ نەبوونی وشیاری رۆشنبیری میللەت دەگەڕێتەوە کە فاکتەرێکی ترسناك و سەرەکی یە بۆ دواکەوتنی کۆمەڵگا و وڵات، دەڵێ :

**((عەیبە.. عەیبە..)) ئەی رەفیقان مالی خەڵك وێران ئەکا**

**پیاو ئەخاتە سواڵ و سووکی، گەورە سەرگەردان ئەکا**

**واسیتەی عەیبە کەدائیم قەومی کورد بێ سەروەتن**

**بێ مەعاریف، بێ سەنایع تووشی صەد دەردیان ئەکا**

**سەیر ئەکەی شەخسێکی مەئموور گەر وەزیفەی لێ برا**

**هیچی پێ ناکرێ لەبەرعەیب، ماڵی خۆی تالان ئەکا**

...................................................................

**سەیری کە ئەم عەیبە عەیبە چەندە تەئسیری هەیە**

**کوردی کردۆتە موهاجیر ئیشی ناوشاران ئەکا**

**چونکە پێی عەیبە لەجێی خۆی ئیش بکا قەدری ئەبەن**

**بۆیە وا ئەڕواتە غوربەت تەرکی کوردستان ئەکا** [2]

---

١- پیرەمێرد پێداچوونەوەیەکی نوێ بەژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم: ل ٣١٧ .

٢- دیوانی بێکەس: ل ٥٤ .

بەم پێیە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا شیعر وەکو کەرەستەیەکی بایەخدار لەم قۆناغەدا لەپاڵ ئەرکە سیاسی و نیشتمانییەکەدا ئەرکی کۆمەڵایەتی دەخرێتە سەرشان و، شاعیرانی کورد وشیارانە وەکو پێویستییەکی بارودۆخی قۆناغەکە توانییان بەدەقە شیعرەکانیان هەست و خواست و نیاز و پێویستییەکانی کۆمەڵگای کوردەواری دەربڕن و ئەمەش دەمانگەیەنێتە ئەو راستییەی کەوا هەردەقێکی ئەدەبی بۆ ئەوەی نەمری بەخۆوە بگرێ دەبێت لەکانگای سروشتی خۆیەوە هەڵبقوڵێ و ئاوێتەی کێشەکانی کۆمەڵەکەی بێت و بێ ئاگا و بەدووره پەرێزی نەوەستێ.

### ٤- ئەرکی ئایینی شیعر:

ئاشکرایە کە شیعری ئایینی خاوەن رەگێکی قوول و پتەوە و بۆ سەردەمێکی کۆنی ئەدەبیاتی کوردی دەگەڕێتەوە، دیارە ئەم بیر و باوەرە و دەربڕینی هەستی ئایینی موسڵمانێتی شاعیرانی کورد لەشیعرەکانیان هەر بەردەوام بووە: ((بەنرخترین سەرچاوە بۆ شیعری ئەو قۆناغە (نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم)، وەکو لاساییکردنەوەی رێچکەی ئەدەبیاتی ئیسلامی، قورئانی پیرۆز بوو. چونکە قورئان کاریگەرییەکی راستەوخۆی بەسەر شاعیرانەوە هەبوو. بۆیە مەسەلەیەکی نامۆ نەبوو، کە میللەتێکی وەکو کوردی موسلمان قورئان و پەیرەوەکانی ئایینی ئیسلام کودەتایەکی مەزن لە رەوت و ژیانی رۆژانەی بەرپا بکەن. سەرچاوەی دووەمی کاریگەری شیعری ئەو قۆناغە فەرموودەکانی پێغەمبەر بوون. کەواتە هەردووکیان پێکەوە سەرچاوەیەکی گرنگ بوون لە بەرجەستە کردنی پێوەرە ئایینی و ئاکارییەکان لەشیعری کوردی ئەو قۆناغەدا)). [1]

ئەرکی شیعرە ئایینییەکانی ئەم قۆناغە پیشاندانی (خواناسی و دوعا و پارانەوە و...)ی پێ بینراوە.

**(حەمدی) لەشیعری خواناسی دەڵێ:**

**باخصوص ئەو خودا پیاوانەی**
**موهیمی (نعبد) و (ایاك) ن**
**پڕدەم و پڕ زوبان و دلیانە**

١- سوسیولوژیای شیعری کوردی: ل ١٥٨ .



**هەموو بەم ذیکرەوە فەرەحناکن**
**لە ئەزەل تا ئەبەد خوا خوایە**
**جیلوە یەکە کەپڕ دوو دنیایە**
**یائیلاهی بەقەدری تۆ بێ شك**
**(ماعرفناك حق معرفتك)** [1]

لای (پیرەمێرد)یش سۆزی ئایینی بووەتە بنیاتنەری گەلێ لەدەقە شیعرییەکانی و پابەندبوونی خۆی وەك ئیماندارێك بە ئایینەکەوە دەخاتەڕوو:

**خوای گەورە و بزورگ پادشای رێی نیاز**
**بێ هاوبەش، بی کەس، بێ شوێن بێ هاوڕاز**
**تێگەیشتنت دامێ تێتبگەم**
**پێم لێنا هەر تۆی، بێ زیاد و کەم**
**چاوم هەلبڕی، ئاسمانم دی**
**وتم بێ وەستا نەهاتۆتە دی** [2]

هەر لە روانگەی ئایینەوە شیعر بە خستنەڕووی چیرۆکی قورئانی، دوارۆژی ئەو کەسانەی کە دژایەتی خوا دەکەن پیشاندەدا:

**مووسا و مریدێن وی**
**هەمی**
**بێ پر و بێ گەمی**
**ژ وێ دەریایێ دەرباز بوون**
**ژ جەور و جەفایێ خەلاس بوون** [3]

(سەفوەت)ی شاعیریش لە معراج نامەکەیدا باس لەو گەشتە دەکا کە پێغەمبەر لەشەوی میعراجدا بەرەو ئاسمان کردوویەتی و تیایدا ستایشی پێغەمبەریش دەکا و: ((ئەم بۆنە ئایینییە

١- دیوانی حەمدی: ل ١٠٢ .

٢- پیرەمێرد، بەرگی دووەم: ل ٦١ — ٦٢.

٣- قەدری جان شاعیری داهێنەر و نیشتمان پەروەر: ل ١٢٥ — ١٢٦ .

لەناو موسڵماناندا بەتایبەتی لەناو گەلی کورددا پایەیەکی بەرزی هەیەو هەموو ساڵێ یاد دەکرێتەوە و زۆر لەزانا و مەلای کورد ئەم بابەتەیان بەشیعر و پەخشان هۆنیوەتەوە و (سەفوەت) یش وەکو مەلا و خەتیب و پێشنوێژی مزگەوت بایەخی بەم بابەتە داوە و میعراج نامەیەکی نووسیوە)). [1]

**دوای ئەمانە هاتە خزمەت ئەو شەهنشاهە بۆ راق**
**بەرق ئاسا چوست و چالاك تەی کەری (سبع الطباق)**
**رەنگی وەك دووڕی سپی هەنگاوی تامەدی بەسەر**
**خاوەنی دووباڵ لەبن رانا کەزوو بفڕێتە سەر**
..........................................................................
**جا گەییە بیتولمەقدەس زاتی پڕ عیز و شەرەف**
**داخلی بیتولموقەدەس بوون مەلائیك سەفە بەسەف** [2]

هەر لە تێڕوانینی بۆ موسڵمانێتی لە یاد و بۆنەی لەدایك بوونی پێغەمبەر (د.خ) کە بەجەژنی مەولوود ناسراوە، سەفوەت دەڵێ:

**بەجەژنی مەولوودی زاتێ ئەنازم**
**لەسایەی لوتفی ئەودا سەرفرازم**
**نەوەك ئەولوتفە تەنیا بۆ منە و بەس**
**نیگاهێکی نەجاتە بۆ هەموو کەس**
**رەسوولێ هاتە روو، رۆژی بو عالەم**
**بەجارێ نوقمی دەریای جەهل و ماتەم** [3]

١- ژیان و بەرهەمی سەفوەت، عەباس سالح عەبدوڵلا، نامەی ماجستێر، کۆلیجی (زمان)ی زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠١: ل ٢٧.
٢- دەستنووس، میعراج نامە .
٣- دیوانی سەفوەت، پێشەکی و ئامادەکردن و پەراوێز بۆ نووسینی دکتۆر عزەدین مستەفا رەسوول، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٤: ل ١٣٥ — ١٣٦ .



هەر لەم قۆناغەدا هەندێ جار شیعری ئایینی لای شاعیرانی کورد پیشاندانی رووی گەشی ئایینی ئیسلام بووە و ئاوێتەکردن بووە بەکێشەکانی تری نیشتمانی و کۆمەلایەتی.

شیعر لە روانگەی بەستنی ئەرکی ئایین بە خۆشەویستی نیشتمان، لای (شێخ مەحموود)ی نەمر بەپشت بەستن بەئایەتی قورئانی پیرۆز دەربڕین و پیشاندانی خۆڕاگری و شانازی بەوەی کەلەنەوەی کوردە و هەروەها سوور بوون لەسەر داواکردنی ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوەکەی پێ ئەنجام دراوە:

**تا بە ئازادی ئەگەم کوێری ئەکەم چاوی رەقیب**
**شاسواری قەومی مادم میللەتێکی زۆر نەجیب**
**(اطلبُ النجاح والتوفيق من رب مجيب)**
**ئایەتی (نصر من الله) بە (فتح قريب)**
**دەنگی تەکبیری سبەینانم بە ئیلەڵلا ئەکا** [1]

لای (سلێمان بدرخان)یش خۆشەویستی نیشتمان ئاوێتە بە بیر و باوەری ئایینی پیرۆزی ئیسلام کراوە، بۆ پیشاندانی ئەوەی کە ئایین رێگر نەبووە بۆ خۆشەویستی و خزمەتکردنی نیشتمان بەڵکو خۆشەویستی نیشتمان بەشێکە لە ئیمانداری بۆیە لێرەدا شاعیر ئاماژە بەفەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) (خۆشەویستی نیشتمان لەباوەڕدایە) دەکا و دەڵێ:

**ئاخ کوردستان**
**حمد و ثنا بۆ انس و جان**
**بۆ خالقی کون و مکان**
**خصما کو أڤ نوعی انسان**
**دایە ژیرا عقل و زمان**
**حبا ولات ژ ایمانی**
**ئاخ کوردستان، ئاخ کوردستان** [2]

١- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم: ل ١٧٧ .
٢- گۆڤاری هاوار، ژ (١٠)، س ١، ١٩٣٢: ل ٢ .

شیعری ئایینی لای (شێخ نووری شێخ ساڵح)یش ئەرکی ئایینییەکەی بەخۆشەویستی نیشتمانەوە دەبەستێت: ((.. لای شێخ نووری هەندێ دێر لێرە و لەوێ ئەبینین، کە لەڕووی باوەڕەوە سەر بەئایینی ئیسلامی شاعیری تێدا دیارە، بەڵام زۆر جار ئەم باوەڕە بەستراوە بەنیشتمانپەروەری یەوە..)) [1]، شێخ نووری تەنها باوەڕی خۆی وەکو موسلمانێك پیشان نادا بەلکو دەیەوێ بڵێ کورد هەمووی موسلمانە و ئامانجی خزمەتکردنی ئایینی ئیسلامە:

**هەرچی باش و چاکە بیکەی وەختی سەرفی هیمەتە**
**هەچ کەسێ کۆشش ئەکا راستت ئەوێ بێ مروەتە**
**وەقتی تێکۆشینە رۆژی ئیستیقامەت عیفەتە**
**مەقسەدی کورد هەر تورەقیی دینی ئیسلامیەتە**
**سادەخیلتان بم زەمانی ئیتیحادو ئولفەتە** [2]

لەلایەکی ترەوە شیعری ئایینی ئەرکەکەی لەڕێگەی ئاوێتە کردنی بە بابەتی کۆمەڵایەتییەوە پێ بینراوە:

شێخ نووری شێخ ساڵح لە هاندانی میللەتی کورد بۆ بایەخدانیان بەخوێندن و بەدەستهێنانی زانست و زانیاری پشت بە فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ) دەبەستێت:

**واسیتەی عیلمە کە (پێنجوینی) و (زەهاوی) و (مەولەوی)**
**ناوی پاك و عالی یان ئیحیای کوردستان ئەکا**
**(اطلب العلم ولو بالصین) بەفەرموودەی رەسوول**
**ئەم حەدیسە بۆ عیلم، تەرغیبی ئینس و جان ئەکا** [3]

دیارە (زێوەر) شارەزایی و زانیارییەکی تەواوی لەبارەی ئەرك و سوننەتەکانی ئایینی ئیسلام هەبووە ، بۆیە لەڕوانگەی ئەرکی ئایینییەوە شیعر لای زێوەر ئامۆژگاری بەئاماژەکردن بەفەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) (من سن سنە حسنە فلە اجرها...) بۆ مەبەستی وریا کردنەوەی چینی دەوڵەمەندی کۆمەڵ بە بەخشینی یارمەتی بۆ هەژارانی پێ بینراوە:

١- ئەدەبیاتی نوێی کوردی: ل ١١٠ .
٢- دیوانی شێخ نووری شێخ ساڵح، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم: ل ٣١٣.
٣- هـ. س : ل ٣٣ — ٣٤ .



**خێر و سەدەقە بدە بەفەقیر**
**((ئەمما فەقیرێ)) سەقەت بێ یا پیر**
**تەلەبەی علوم حەفەزەی قورئان**
**هەموو لایقن بە ((خێر و ئیحسان))** [1]

لێرەوە دەگەینە ئەو راستییەی کەوا ئەرکێکی تری شیعری کوردی لەم قۆناغەدا ئەرکی ئایینی بووە کە دەربڕینێکی راستەقینەی هەست و سۆزی ئایینی و پیشاندانی موسلمانێتی شاعیران و میللەتی کورددا خۆی پیشان دەدا .

## ٥- ئەرکی جوانی شیعر:

دیارە شیعری کوردی لەم قۆناغەدا رووی لە بەدیهێنانی ئەو ئەرکانە کردبوو کە شاعیران بەپێویستیان دەزانی بۆ خزمەتکردنی بەرژەوەندی کۆمەڵ و گۆڕانکارییەکانی ئەو کاتە و تیایدا ئەو هەست بەلێپرسراوەییە کردبوویان بەپەیامی خۆیان بۆیە ئەرکی جوانی لەم قۆناغە دابە و چەمکەی کە بچێتە بازنەی هونەر بۆ هونەرەوە گەلێ سنووردار و بەرتەسك بووە.

ئەو دەقانەی کە دەکرێ وەك دەقێکی شیعری تەماشا بکرێن کە ئەرکی جوانی دەبینن زیاتر ئەو دەقانەن کەڕوویان لە جوانییەکانی دەرەوە کردووە، وەك جوانی ئافرەت و جوانی سروشت، هەندێ جاریش ئەو دەقە شیعرییانە دەگرێتەوە کە تیایدا بۆ بەدەستهێنانی وێنەیەکی شیعری جوان بایەخ بە رووخساری دەرەوەی دەقە شیعرییەکە دراوە و دیارە کە ئەمەش زیاتر لەڕێگەی بەکارهێنانی هونەرەکانی رەوانبێژی دا کراوە کە تیایدا ناوەڕۆك لەخزمەتی رووخسار دا بووە.

هەندێ لە شاعیرانی کوردی ئەو قۆناغەدا کاریگەری رێبازی هونەر بۆ هونەری ئەورووپییان لەسەرە، بەتایبەتی هەندێك لەشیعرەکانی گۆران ئەم کاریگەرییەی بەتەواوی پێوە دیارە، هەروەك (گۆران) خۆی دەربارەی رێرەوی شیعرەکانی ئەڵێ:

((لەسەرەتاوە بەهۆی ئەدەبی ئینگلیزییەوە بەدوا نظریەی هونەر بۆ هونەر ئەرۆیشتم و بەرهەمی ئەم تەرزە ئەدەبەم ئەخوێندەوە، وکو هینەکانی (جون کیتس) و (ئوسکار وایلد))) [2]

١- دیوانی زێوەر، سۆزی نیشتمان: ل ٤١ .
٢- دانیشتنێك لەگەڵ گۆران دا، نووسینی عبدالرزاق بیمار، گۆڤاری بەیان، ژ (٢) ی شوباتی ١٩٧٠: ل ٣٠ .

هەڵگرانی دروشمی ڕێبازی هونەر بۆ هونەر کەلەدژی ڕێبازی هونەر بۆ کۆمەڵ سەریان هەڵدابوو، بەلایانەوە شیعر و هونەر دەبێت لەهەموو سوودێك دابماڵێت چونکە ئەدەب خۆی لەخۆیدا ئامانجە، بۆیە نابێت بکرێت بەهیچ ئامرازێك بۆ هەر مەبەستێکی تایبەتدار، (تیوفێل گۆتییێ) لەم بارەیەوە دەڵێ: ((پێویستە هونەر بەتەواوەتی لەمەسەلە کۆمەلایەتی و سیاسی و ئەخلاقییەکان بەدووربێت... هەموو کاتێك هەرشتێك بەسوود بوو، ئیتر ناتوانێ جوان بێت. ئێمە بەرگری لە سەربەخۆیی هونەر دەکەین، هونەر بۆ ئێمە ئامراز نییە، بەلکو ئامانجە)). [1]

هەرلێرەوە دەتوانین گەلێ لەشیعرەکانی گۆران وەکو (ئافرەت و جوانی، ڕەوتێکی جوان، بۆ جوانی سەرەڕێ، جوانی بێ ناو..) کە ڕاستەوخۆ لە ناونیشانەکانییەوە دیارە، بیخەینە ژێر بەدی هێنانی ئەم جۆرە ئەرکەوە.

دیارە کە گۆران خۆشی دان بەو ڕاستییە دەنێ وەك لەپێشەکی دیوانەکەی ئاماژەی بۆ دەکات: (((بەهەشت و یادگار) کۆمەلە شیعرێکە لەدیوانەکەم سەرانسەر لەگەل بابەتەکانی جوانی و دلداری خەریکە.)) [2]

(گۆران)ی جوانی ناس جوانی ئافرەتی کردووە بەئاییینی خۆی و دەیپەرستێ، بۆیە هەمیشە سەرچاوەی ئەرکی جوانی بینین لای گۆران، لەڕێگەی جوانییەکانی ئافرەت و سروشتەوە بووە کەتەنها مەبەستی پیشاندانی جوانی بووە:

**سل مەکە لە مەیلی بەگەرمی ڕوانینم**
**پیاوێکم جوانییە قیبلەگای ئایینم**
**سەرنجێك من ئەیدەم لەم بەژن و بالایە**
**لەسینەی پاکەوە بۆ جوانی تەنیایە** [3]

بۆ بەدەستهێنانی دەقێکی جوان لەشیعرا شاعیر بۆ ئەو شتە نادیار و شاراوانە و بێ دەنگانە گەڕاوە کە کەم کەس هەستیان بەبوونی ئەو جوانییانە کردووە: ((گەڕانی گۆران بەدووی

١- ڕێبازە ئەدەبییەکان، ئامادە کردن و وەرگێرانی لە فەرەنسییەوە د. فەرهاد پیربالّ : ل ١٣١.
٢- دیوانی گۆران: ل ٣ .
٣- دیوانی گۆران: ل ٢٦ .



ئەو شتە بچووك و هێمن و شاراوانەدا، گەرانی ڕۆحی تینوو نەسرەوتی گۆرانە بەدوای دۆزینەوەی مانایەکی تازەدا بۆ شتەکان.. واتە دۆزینەوەی مانایەکی تازە بۆ پەیوەندی مرۆڤ بەجیهانی دەورو بەریەوە، بۆژیان..ئەو ڕاستییە دەردەبڕێ کە گۆران خاوەنی زەین و ڕوونییەکی ئیستاتیکی بالا بووە و، هەستی جوانیپەرستانەی ئەو بچووکترین وێنەی سەرنج ڕاکێشی بەخەسار نەداوە و زەوقی هونەرمەندانەشی خێرا گواستویەتییەوە بۆ ناو ئەلبوومی ڕازاوەی هونەری جوان)). [1]

**ئەی کچە مانگەکەی بەدەنگی چپە دوو**
**گەندە مووی دەم و چاو مەچەك هەڵنەگرتوو** [2]

ئەمجارە گۆران لەیادکردنەوەی یادێکی ڕابووردووی خۆش ئەرکی جوانی بەشیعرا بینیوە: ((لەشیعری ئەو سەردەمەیدا خەیالێکی تێکەل بەگەشبینی، یا بەدوای جوانیدا گەڕان، لەهەر شوێنێ بێ دیارە، چ لەناو ئەستێرە و مانگ و گولّدا، یا لەناو نازدارانی بەرەو کانی ڕۆیشتوو بەگۆزەی ئاوەوە... یا لە باوەشی سروشتی گریاودا، گۆران توانایەکی گەورەی لە دەستنیشان کردنی تابلۆی جوان و ڕەنگ کێشان و نواندنیدا هەیە ئەو تابلۆیە لە هەر شوێنێك بێ)). [3]

**بلێن بەیار، بلێن بەیار، یاری نازدار**
**سەد هەزار جار خۆزگەم بەپار منی هەژار**
**خۆزگەم بەپار!**
**ڕۆژ نەبوو چاوم بەدیدار**
**شاد نەبێ، نەسرەوێ ئازار**
**ڕۆژ نەبوو یار بەلەنجەولار**
**چەشنی ئاسکی هەردەی بەهار**
**بەبەردەما نەکا گوزار**
**نەمپێکێ نێو نیگای خومار** [4]

١- ئافرەت و جوانی لە شیعری گۆراندا، کەمال مەمەند، گۆڤاری نووسەری کورد، ژ (١)، سالّی ١٩٧٩: ل ٢٤ .
٢- دیوانی گۆران: ل ٤٥ .
٣- ئەدەبیاتی نوێی کوردی، د. عیزەدین مستەفا ڕەسوول : ل ١٢٩ .
٤- دیوانی گۆران: ل ٢١ — ٢٢ .

سەرچاوە و کەرەستەیەکی تری شیعری کوردی کە ئەرکی جوانی پێ بینراوە، وەسفی سروشتە، دیارە (گۆران)ی شاعیر لەمەشدا دەستێکی بالای هەبووە و وەك لە زۆرینەی شیعرەکانیدا دەکەوێتە بەرچاوم هەست دەکەیت کە چ مرۆڤێکی جوان پەرست بووە بەتایبەتی لە وەسفی وردی جوانی سروشتی شاخ و دۆڵ و کانی و دار و بەرد و گوڵ و گوڵزاری کوردستاندا.

**گیانی من بۆ تەلیێ وەنەوشە پەرۆشە**
**کەلەژێر سێبەری تووترکا خامۆشە**
**کانییەکی روونی بەر تریفەی مانگە شەو**
**لەبنیا بلەرزێ مرواری زیخ و چەو**
**جوانترە لەلای من لەدەریای بێ سنوور**
**شەپۆلی باتە بەر تیژکی رۆژ شلپ و هوور!** [1]

هەر لە وەسفی سروشتدا لە وەسفی یەکە یەکەی شوێنەوار و ناوچەی هەورامان و گواستنەوەی وێنەکانی سروشتی هەورامان وەك خۆی ئەرکی جوانی بینیوە:
**کۆمەلە شاخێك سەخت و گەردن گەش**
**ئاسمانی شینی گرتۆتە باوەش**
**سەرپۆشی لووتکەی بەفری زۆر سپی**
**بەدارستان رەش ناو دڵی کپی** [2]

هەر لەم قۆناغەدا گەلێ لەشاعیرانی پەیرەویکەری رێبازە کلاسیکییەکە ئەرکی جوانکارییان بەدەقەکانیان بینیوە، (ئەحمەد موختار) لەدەربڕینی دەقێکی جوان دەڵێ:
**کەدولبەر خۆی نواند خورشیدی خاوەر زوو فیراری کرد**
**خەجالەت ما بەزەردی عەزمی پشتی کۆهساری کرد** [3]

١- دیوانی گۆران: ل ٤٥ — ٤٦ .
٢- دیوانی گۆران: ل ١٢٧ .
٣- دیوانی ئەحمەد موختار جاف: ل ١٢ .



(حەمدی) شاعیریش بە بەکارهێنانی هونەرەکانی رەوانبێژی دەقێکی جوانی دەربڕیوە و دەڵێ:
**بالی کێشاوە بەسەر حوسنا لەدوولاوە برۆ**
**وەك هوما گەییە مەقامێك پێی لەسەر چاوە برۆ**
**روتبەیی بالا بەئینسانی بچووکی قەت مەدەن**
**چون لەرووی رۆژا بزانە تیغی کێشاوە برۆ**
**رەنگە قەت ئەهلی محەببەت یەك کەسی لێ دەرنەچی**
**تیغی راکێشاوە ئەمری کوشتنی داوە برۆ** [1]

لای (عەلی باپیر ئاغا)ش: ((داهێنانی شاعیر لەو لەیەکچوونە جوانەیە کەلە نێوان مانگ و رووی یار دیاری دەکا. مانگی یەك شەوە رۆژ لەدوای رۆژ زیاد دەکا بۆ ئەوەی لەشەوی چواردە وەکو رووی یار جوان بێ. کەدەگاتە ئەو شەوە رووی یار لەوجوانتر دەکەوێتە بەرچاو، لەبەر ئەوە لەداخانا رۆژ لەدوای رۆژ لاواز دەبێ، تالەدواییدا بەجارێ لەناو دەچێ.)) [2]
**مانگی نوێ بۆیە هەموو شەو زیاد ئەکا و ئەشنێتەوە**
**تاجەمالی هەروەکو رووی تۆ برازێنێتەوە**
**کاتێ بوو بەچواردە هەم شەو تێ ئەگا نابێ بەرووت**
**جالەداخا وردە وردە کەم ئەکا و ئەتوێتەوە** [3]

هەر بەمەبەستی چنینی دەقێکی جوان لەشیعردا، (بێکەس) پەنا دەباتە بەر غەزەلێکی (سالم) و پێنج خشتیەکی جوان دەردەبڕێ:
**لەکۆڕی بەزم و رەزما، لە حالەتێکی مەستا**
**دانیشتبووم لەناکاو، عوود و کەمانە وەستا**

١- دیوانی حەمدی: ل ٥١ .
٢- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی شەشەم: ل ١٩٩ .
٣- دیوانی کەمالی ( عەلی باپیر ئاغا) ئامادە کردن و پێشەکی نووسینی کەمال عەلی باپیر، پێداچوونەوەی مامۆستا شکور مستەفا، دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، ١٩٨٦: ل ١٩٥ .

**لەحیرەتا سەراپا مەجلیس عوموومی هەستا**

**((یارم لە ئەندەروون هات دەستی رەقیب لە دەستا**

**غەمناك و شادمانم، رەحمەت عەزابی هێنا))** [1]

هەر لەم قۆناغەی شیعریدا هەندێ جار بۆ مەبەستی دەربڕین و داهێنانێکی جوان لەشیعرا شاعیر پەنا دەباتە بەر زارێکی تر کە زاری قسەکردنی خۆی نییە، وەك لای (زێوەر) دەبینرێ کەبە زاری هەورامی و لەوەسفی جوانی سروشتی بەهاری رازاوە بەگوڵی نێرگس و چوونە سەیران و ئاهەنگ گێڕان لەم وەرزە دڵگیرەدا کە زەوی یەك پارچە بەرگی سەوزی پۆشیوە، دەڵێ:

**نەو بەهار بەزمەن**

**پەرێ ((عوشاقان)) نەو بەهار بەزمەن**

**خۆشی دەروونەن، سەیرانەن رەزمەن**

**(عالەم) دل گوشا ئاهەنگەش (عەزمەن)**

**(عالەم) بەرگی سەوز پۆشا سەراسەر**

**یەك سەر ((جەننەتەن)) سەحراو دەشتودەر**

**((نێرگس)) دیدە مەست لا لەرەنگ سوورەن**

**گوول مەسنەد نشین — بلبل — رەنجوورەن** [2]

لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا هەندێك لە دەقە شیعرەکانی ساڵانی (١٩٢٠-١٩٥٨) و بەکاریگەری ئەدەبیاتی ئەورووپی ئەرکی جوانکارییان داهێناوە.

### ٦- ئەرکی سۆزداری شیعر:

مەبەست لەئەرکی سۆزداری بریتییە لە بزواندن و دەربڕینی هەست و سۆزی خودی و دەروونی شاعیر لەشیعرا بە مەبەستی دەربڕین و پیشاندانی وەفا و خۆشەویستی شاعیر بەرامبەر بە کەسانێك کە ئازیز و نزیکی شاعیرن (هاوڕێ، خزم و کەس، یار،...)، یان بۆ یاد و بۆنەیەك جا ئەو بۆنە و یادە لەوانەیە خۆش یا ناخۆش بێت کە کاریگەری و شوێنەواری لەدڵی

١- دیوانی بێکەس: ل ٩١ .

٢- دیوانی زێوەر، سۆزی نیشتمان: ل ١٠٠ — ١٠١ .



شاعیرەکەدا شوێنی تایبەتی خۆی هەیە، چونکە ئەم جۆرە ئەرکە تایبەتە بەسۆزی دەروونی شاعیرەکە خۆی.

ئەرکی سۆزداری هەندێ جار لەرێگەی ستایشەوە هەست و سۆزی شاعیر بەرامبەر بە کەسێکی ئازیز دەربڕراوە، وەك لە ستایش کردنی (رەشید نەجیب) بۆ هاوڕێی شاعیری (شێخ نووری شێخ سالح) بەمەبەستی دەربڕینی سۆزی خۆشەویستی و وەفا و دڵسۆزی و هاوڕێیەتی بەرامبەر بە (شێخ نووری) و یاد کردنەوەی رۆژانی خۆشی کەلە نێوانیاندا هەبووە:

**ئەی کێوی عەسر دیدە ئەتۆی مازیی ئوممەت**

**تەئییدی ئەکەی خاتیرەیی شاهیی کوردان**

**بۆشەوکەتی رابووردوو و ئەییامی سەفامان**

**برژێتە گەواهی حەشەم و قودرەتی میللەت**

..................................................

**ئەی موڵهیمی ئەشعاری لەتیف، کێوی سەر ئازاد**

**ئەی باعیسی دەنگی سروودی شاعیری ناشاد** [1]

(گۆران)ی شاعیر لەوەڵامی ئەو نامەشیعرییەی کەشێخ نوری بەناوی جەنابی کوڕی بۆ (گۆران)ی نووسیوە و لە رۆژنامەی (ژین) بڵاوی کردبووەوە * بەستایشی (شێخ نووری) هەست و سۆزی رێز و خۆشەویستی هاوڕێیی بۆ دەردەبڕێ و دەڵێ:

**ئەی (ژیان) پاش شکایەتی دووری،**

**ماچ کە چاوی جەنابی شێخ نووری!**

**ماچ کە چاوی بەتاسەوە، کە جەناب**

**دەرسی ئەووەڵ گەیشتەخەتمی کیتاب!..**

**راستە شیعری رەواج و قیمەت دار،**

**باوکی تۆ بوو بنێری بۆ بازاڕ،**

**راستە ئێستەش بەدۆسییە و دەفتەر**

١- رەشید نەجیب (١٩٠٦ — ١٩٦٨) ژیان و بەرهەمەکانی، ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١: ل ٢١ .

* بڕوانە دیوانی گۆران: ل ١٢٢ .

داخراوە لەمێشکی شەش — دەر..
لاکین ئاخۆ چ شاعیرێکی تر
شیعرە پیشەی بەدائیمی، سەر و مڕ؟
باوکتە، تۆیی، منم، ئەمەیا ئەو
**هەوڵی نانە بەڕۆژو، شیعرە بەشەو** [1]

ئەرکی سۆزداری لەدەقی (بۆ هیوای کوڕم) دەربڕینی هەست و سۆزی باوکێتی بەرامبەر بە گریانی جگەرگۆشەکەی و: ((لەم هەڵبەستەدا، عاتیفەکەی خۆی بە گەرم و گوڕی لەدایك بوونە هەوەڵی یەکەوە، دەردەبڕی.. وشە، لێرەدا، دەوری وەسف کردن، لەدەرەوەڕا، نابینێ.. بەلکو یەکسەر حاڵەتەکە دەنوێنێ و سۆزە دەروونییەکە دەگەیەنێ. وشە خۆی چ وەك دەنگ و ئاواز، چ وەك مەبەست و مانا و نیاز، هەست و حاڵەت و عاتیفەکەیە. ئەمەش لەدووشتەوە سەری هەڵداوە: راستگۆیی دەروونی و بوونی توانست و بەهرە و ئەداتی هونەری..)) [2]

چی یە، توخوا چ سیڕڕێکە وەها مەحکوومی گریانی،
کەتۆ هێشتا لەخەم ناگەی؟ لەمەعنای گریە نازانی؟
ئەگەر وەك باوکە حەسرەت دیدەکەت زەهرت بچێژایە،
زەمان گەردی ئەمەلتی گشت بەدەم باوە بپێژایە،
.......................................................
بەلێ، رۆلەم ئەگەر وەك من کەمێك بەدبەختیی ئیدراکیش
لەتۆیشی رەش بکردایە، نەوەك شەو، رۆژی رووناکیش
.......................................................
حەقت بوو ئەم هەمووو گریانی نامەفهووم و بێ مەعنا:
زەمانی بەسط و تەقریری شکاتت بێ لەدەست دنیا
حەقت بوو بێ و چان بگری بەسەر تاوانی باوکیما،
بەحر پرکەی لەتف بیدەی بەناوچاوانی باوکیما!... [3]

١- سەرچاوەی پێشوو : ل ١٢٢ .
٢- ((بۆ هیوای کوڕم))ی گۆران: لێکدانەوە و شی کردنەوە کەمال مەمەند گۆڤاری نووسەری کورد، ژ (٦) شوباتی ١٩٨١: ل ٢٦ — ٢٧ .
٣- دیوانی گۆران: ل ٢٠١ — ٢٠٢ .



ئەرکی سۆزداری هەندێ جار لەرێگەی شیعری (لاوانەوە) بەرامبەر بەکەسێکی خۆشەویستی شاعیر دەربڕاوە: ((کاتێ شاعیر بۆ مردوو دەگری و بۆی دەسووتێ پێی دەو ترێ (شین و شەپۆر)، کە وێنەی ئەو کارتێکردنە پیشان دەدات کە شاعیر دوای مردووەکە تووشی دەبێت وەك بیری ئالۆزی و پەشێوی و... دل پڕخەم... ئەم جۆرە لاوانەوەیە سۆزێکی راستگۆیانە هەڵدەگرێ چونکە دەربڕین لەتاقیکردنەوەیەکی زیندوو دەکات کە شاعیر پێیەوە دەناڵێ جا ئەو کەسەی کەلێی ون دەبێ کوڕ یان ژن یا کەسێکی خۆشەویستیەتی.)) [1]

(گۆران) لە لاوانەوەی (بێ کەس) دا سۆز و خەمی خودی کەسی خۆی بەئاوێتەکردنی ستایش و پیاهەڵدانی (بێ کەس) دەردەبڕێ:

ئەی فریشتەی شیعری جوان
کۆستی کەوتووی هەردوکمان
بۆ ئەم جارە بێ کەسە
کەوتمان بێ کەس، بەسە
..............................
سەرەڕای بەهرەی فەننی
دلسۆز بوو بۆ وەتەنی
کێ والەژێر زنجیرا؟
ئازادی هات بەبیرا
بەشیعری جوان نەڕانی
بەیادی کوردستانی [2]

(دیلان)یش لەدەقی شیعری (هاورێم حەسەن)دا و لە لاوانەوەکەیدا سۆزێکی راستەقینە لەدڵ و دەروونیدا بەرپابووە و توانیویەتی هەست و سۆز بجولێنێ و کاریگەری دەقە شیعرییەکەش لەسەر خوێنەر و گوێگر بەجێ بهێڵێ:

١- ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، دکتۆرە شوکریە رەسوول، مطابع التعليم العالي، ١٩٨٩: ل ٦١ .
٢- دیوانی گۆران: ل ١٠٤ — ١٠٥ .

ئەی کۆچی پڕ لەناڵە
سۆز بۆ گەرووی شمشاڵە
هەل ڕێژێ هەنسکی قووڵ
بەرد بێنێتە جم و جووڵ
داری گریان بنێژێ
فرمێسك بەخەڵك هەڵڕێژێ
ڕەشی بەشار بپۆشێ
پیالەی خەفەت بنۆشێ
بۆ ((حەسەن)) بێتە جووڵە
بەئەو هەنسکە قووڵە[1]

(کامەران موکری)یش لە (گولی وەریو)دا دەربڕینی سۆز و لاوانەوەکەی دوو جەمسەری گرتۆتەوە، جەمسەرێکیان دەربڕینی سۆزی هاوڕێیەتی و خەم و خەفەت خواردن بۆ نەمانی هاوڕێی (حەسەن) ئینجا بەستنەوەی بەجەمسەرەکەی تر کە دەربڕینی هەست و سۆزی کوردانەیە بەم بۆنەیەوە:

برام ئەمەوێ هۆنراوە
بنووسم بۆت بەم خوێناوە
بەخوێناوی دڵ، خوێنی چاو
خوێنی سنگی برا کوژراو
بەخوێنی هاوڕێیەکی شەنگ
کەبوو، بەنیشانەی تفەنگ
بەخوێنی (ئەختەر) و (بەکر)
بنووسم شیعری وەك ئاگر
بەلام کاغەزەکەم سووتا
چونکە دل گڕی تێ بەردا

١- دیوانی دیلان: ل ٩٢.



بۆیە هەرچەند ئەکەم شیعرم
ناتوانم جەمسەری بگرم
............................
**تۆش بەسوێی ئەو برینەوە**
بەدڵێکی غەمگینەوە
جێت هێشتین ئاوارەو ناکام
نەتدی کورد بگا بە مەرام[1]

(هەردی) چەند دەقێکی شیعری بەناوی (بۆسەرکێلی گلکۆی ئازیزان) نووسیوە ئەگەر چی ئەم دەقانە لەسەر داواکاری دۆست و برادەران نووسراوە، بەلام شاعیر توانیتی ئەرکی دەربڕینی سۆزێکی ڕاستەقینە بۆ ئەم مەبەستانە ببینێ، وەك (هەردی) خۆی لەبارەی ئەم دەقانە دەلێ: ((بەم بۆنەیەوە پێویستە بلێم: من هیچ شتێکم ئەوەندەی ئەوە پێ گران نییە، کە لەسەر داخوازی خەلك شیعر دانێم، بەتایبەتی ئەو شیعرانەی[2] لەسەرکێلی مردوان ئەنووسرێن، بەلام لەگەل ڕوولێنانی دۆست و ئاشنایاندا ئەلێی چی؟!))

لەسەر زمانی هاوڕێی (موحەمەد کەریم) کەخۆی کوشتووە، دەلێ:

برام واتێ نەگەی ئاخم، لەداخی نائومێدیمە
ئەگەر چی زامی سەرسنگم! نیشانەی جوانەمەرگیمە!
بەلام بۆیە دلم بەر گوللەدا! زانیم کەچی تیایە
دلێ وێنەی کچی تیابێ، نەمانی باشە بۆچیمە؟! [3]

١- دیوانی کامەران: ل ١٢٨ — ١٢٩ .
٢- رازی تەنیایی، ئەحمەد هەردی ، چاپی دووەم، چ. بەڕێوەبەرایەتی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٤ : ل٨٩ — ٩٠ .
٣- هـ. س : ل ٩٠ .

(شێخ نووری شێخ سالح) لە (شیوەنی شێخ عەزیزی برای)دا ئەرکی سۆزداری خۆی بەدەربڕینێکی راستەقینە و سۆزدارانەی بەکوڵ، وەلە دەروونێکی پاکی راستگۆیانە و دڵێکی پڕ لەزام و خەم و خەفەتەوە بینیوە و دەڵێ :

**لەفوارەی دڵ لەبەرچی خوێنی گەش نەرژێتە سەرچاوم**
**لەبەرچی سوور نەبێ داوێنی بەدبەختیی بەخوێناوم**
**کەمن زانیم ئیتر مەرهەم نییە بۆ جەرگی سووتاوم**
**ئەناڵێنم لەدووری تۆ، ئەڵێم شەرتە هەتا ماوم**
**ئەسیری خاکی کۆڕ و نەوجەوانی پڕ مەلالم رۆ**
**عەزیزم رۆ، عەزیزم رۆ، عەزیزی نەو نیهالم رۆ** [1]

هەندێ جار دەقی شیعری دڵداری ئەرکی دەربڕینی هەست و سۆزی خۆشەویستی و ئارەزووی دەروونی شاعیری پێ بینراوە وەك لەدەقی شیعری (ست فاتمە)دا دەبینرێ:

**فاتمە دووچاوی مەستت پڕ تەلیسمی جوانییە**
**پڕ شەرابی خۆشەویستی و عارەقی یەزدانییە**
**بەژن و بالاکەت نمونەی: هەیکەلی یۆنانییە**
**لار و لەنجەت مۆسیقایە، بەستەیە، گۆرانییە**
**بووکی رازاوەی خەیاڵم، گیانەکەم ست فاتمە!**
**تاقە پرشنگێکی چاوت ئەوپەڕی ئاواتمە..** [2]

(کاکەی فەللاح) لەدەربڕینی هەست و سۆزێکی قووڵی دلداری دا دەڵێ:

**ئەی فریشتەی خۆشەویستی**
**خۆشەویستی پاك و بێ گەرد**
**کەوتومەتە تو پەرستی**
**لە ئاسمان بێ یا لە سەرعەرد**
**خۆشەویستم**
**ئەتپەرستم**

١- دیوانی شێخ نووری شێخ سالح، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم: ل ١١٩ .

٢- رازی تەنیایی، ئەحمەدی هەردی: ل ٦٨ .



**بەتۆ مەستم**
**بێ تۆ پەستم**
**بەو چاوە جوانانە قەستەم**
**بێ تۆ ژیانم ناخۆشە** [1]

شێخ نووری بەدەقی شیعری (شەو) سۆزدارانە دەدوێ بۆیە دەوترێت: (هەتا شیعری کوردی بمێنێ، ئەو سۆز و گەرمی و جگەر برژاوییەی لە پارچەی (شەوی) شێخ نووریدا هەیە، هەربەیەکێك ئەبێ لەنموونەکانی دەربڕینی هەستی شاعیر، بەوێنەی جوان، دەربڕینی راستەقینەی هەستی دەروون تێکەڵییەکی خولقێنەرانەی وێنە و وشەی سامانی شیعری کوردی و رۆژهەلات لەگەل دیمەنی راستەقینەی ناوەرۆکی رۆمانتیکی و بەرەو تازە رۆیشتندا، تێکەڵ کردنی هەموو ئاه و حەسرەت و نائومێدیی چەند سەدەی شاعیران بەگەشەی هیوا و ئاوات و بەیان و مژدەی مەرگی شەو و تاریکی و گزنگی رووناکی و سەرکەوتن و شەفەق و بەختیاری.)) [2]

**خۆت بپارێزە لە ئاهی دڵ بریندارانی شەو**
**نەك خوا ناکەردە گیرابێ دوعای نالانی شەو**
**یاوەر و یار و ئەنیسم، ئاهو ئەشکی حەسرەتە**
**ئافەرین ئەی بارەکەڵڵا دیدەیی گریانی شەو**
**ئەشکی حەسرەت لازمی جەمعی سیەه بەختانەهەر**
**شەونمی صوبحە دەلیلی قەترەیی مژگانی شەو**
**هەرکەرووی تۆی دی ئیرادەی بەیعەتی کرد ئافتاب**
**تورەیی موشگینی تازەی کردەوە ئیمانی شەو**
**خەت ئەگەر چی هێرشی هێناوەتە سەر روومەتت**
**حازرە ئەم رۆژە بۆ شکستی شانی شەو**
**دل ئەبێتە قەترەیی خوێن و لەدیدەم سەر ئەکا**
**هەر کەڕابووری بەدڵما سوحبەتی جارانی شەو** [3]

١- کاروانی شیعری نوێی کوردی: ل ١٩٨ .

٢- ئەدەبیاتی نوێی کوردی، د. عیزەدین مستەفا رەسوول: ل ٨٦ — ٨٧.

٣- دیوانی شێخ نووری شێخ سالح، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم: ل٢٢٧.

بەشێوەیەکی گشتی دەبینین کە ئەرکی سۆزداری لەپاڵ ئەرکەکانی تردا بەشێکی دیاری لە شیعری کوردی قۆناغەکە پێك هێناوە، کە پەیوەندییەکی راستەوخۆ و بەتینی بەسروشتی مرۆڤەوە هەیە و لە سۆزێکی بەکوڵ و دەروونێکی پاك و بەجۆشەوە هەڵقوڵاون.

بەگشتی سەرجەمی ئەو ئەرکانەی کەشیعری کوردی لەو قۆناغەدا وشیارانە روویان تێ کردبوو ئەو راستییە دەخەنە بەردەستمان کە شاعیرانی کورد لە بازنەی رێچکەی (هونەر بۆ کۆمەڵ) دا سووڕاونەتەوە و پەیامدارانە روویان لە جیهانی شیعر کردووە و هونەری شیعریان بەرەو بەدی هێنانی ئامانجی دیاری کراودا ئاراستە کردووە.



## ئەنجام

لێکۆڵینەوەکەمان توانیویەتی ئەم ئەنجامانە بە دەست بهێنێ:

١. ئەرکی شیعر یەکێکە لە کێشە هەرە دیار و زیندووەکانی هونەری شیعر و بەردەوام لایەنێکی گرنگ و سەرەکی پێکهێنانی چەمکی شیعر بووە لە ئەدەبی میللەتاندا.

٢. لەقۆناغی کلاسیکیدا شیعری کوردی لەسەر هەمان رێچکە هەنگاوی دەنا کە شیعری میللەتە موسلمانەکان گرتبوویانە بەر هەربۆیە دیارترین ئەرکی شیعری لەئەدەبی کوردی ئەو قۆناغەدا هەر ئەو ئەرکانە بوون کە لە ئەدەبی عەرەبی ئیسلامییەکەدا بەدی دەکرێن.

٣. لەگەڵ ئەوەی ئەرکی ئایینی وەك ئەرکێکی دیاری شیعری لە ئەدەبیاتی کوردی سەر بە هەر چوار زارە سەرەکییەکەی زمانی کوردی بە ئاشکرا بەدی دەکرێ بەڵام ئەو ئەرکە لە ئەدەبیاتی گۆرانی و لوڕی دا زیاتر بەرجەستە بووە و لە پێشەوەی ئەرکەکانی ترەوە دەبینرێ، ئەمە سەرباری کۆمەڵێ ئەرکی تری شیعری لە ئەدەبیاتی گۆران دا.

٤. لەلای شاعیرانی کرمانجی ژووروش بەتایبەتی لای ئەحمەدی خانی شیعر رووەو ئەرکی نیشتمانی و سیاسی کراوەتەوە و بۆتە هەوێنێکی زیندووی شیعریش بۆ قۆناغەکانی دواتری شیعری کوردی سەربەو زارە و شیعری کوردی سەر بە زارەکانی تر.

٥. هەر لەو قۆناغی کلاسیکی دا و لەلای شاعیرانی کرمانجی خواروو ئەرکی جوانکاری بووەتە زەمینەی تاقیکردنەوە شیعرییەکان و ئاوێتەی ئەرکەکانی تری شیعریش بووە.

٦. لە خستنەڕووی ناوەڕۆکی شیعرەکانی ساڵانی (١٩٢٠) بەولاوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا شیعری ئەم قۆناغە زیاتر بەرەو ئەرکی سیاسی و نیشتمانی براون، دیارە ئەمەش بۆ خۆشەویستی و دڵسۆزی شاعیرانی قۆناغەکە و بەرزبوونەوەی هەست و سۆزی نەتەوەیی و هۆشیاری شاعیران لەبایەخی قۆناغەکە بۆ دۆزی کورد دەگەڕێتەوە لەو هەلانەی کەلەبەردەم نەتەوەدایە و کەببووە مایەی وروژاندنی هەست و تینی شۆڕشگێڕانەی مرۆڤ و شاعیری کورد تا دەگاتە رادەی زیندانی کردن و گیان بەخشین لە پێناو بەدیهێنان و پاراستنی ماف و ئامانجەکانی نەتەوەی کورد و خاکی کوردستان.

٧. لەسەدەی بیستەمدا و لە ئەنجامی گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتی و رۆشنبیرییەکاندا ئەدیبان و رەخنەگران و شاعیرانی کوردیش وشیارانە هەڵوێستی پەیامدارانەیان گرتە بەر و بەو چەمکە مامەڵەیان لەگەڵ شیعر و ئەدەبدا کرد کە دەبێ ئەدەب لەپێناوی کۆمەڵدا بێت و بۆ گەل بنووسرێت، دیارە کە کۆمەڵگای کوردەواری لە ساڵانی دوای کۆتایی هاتنی

جەنگی جیهانی یەکەم چەند گۆڕانکاری و قۆناغێکی گرنگی نوێی لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە بەخۆوە بینیوە، ئاشکرایە کە شاعیرانی کوردیش لەم قۆناغەدا وەك هاووڵاتییەکی دڵسۆزی گەلەکەیان بەشیعرەکانیان هەڵوێستی جوامێرانەی تایبەتی خۆیان لە پێناو چاك کردن و بەرەوپێش بردنی ژیانی کۆمەڵگاکەیان لە خستنەڕووی ئەو کێشە و گیروگرفت و فاکتەرانەی کە دەبوونە کۆسپ لەڕێی پێشکەوتنی کۆمەڵ وەك لە باس و بابەتی ئافرەت و داوا کردنی زانست و زانیاری و چاکسازی ئابووری و گوزەرانی کۆمەڵگا و میللەت بەکارکردن دەبینی و هەروەها توانیویانە رۆڵی بەرچاو لە هوشیارکردنەوەی میللەت بەرەو ئاسۆیەکی گەشتر و ڕووناکتر ڕەنگ رێژ بکەن.

٨. هەروەکو درێژە پێدانێك بۆ شیعرە کلاسیکییەکە و پیشاندانی موسڵمانێتی شاعیران و بیر و باوەری خۆیان لەبارەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەدەقی شیعرەکانی قۆناغەکەدا دەربڕیوە.

٩. لەهەندێك دەقی شیعری ساڵانی (١٩٢٠ – ١٩٥٨) و بەکاریگەری ئەدەبیاتی بیانی شیعری قۆناغەکە ئەرکی جوانکاری پێداهێنراوە، وەك لەشیعرەکانی (گۆران)دا کە دەکەوێتە بەرچاو.

١٠. هەر لەسنووری تۆژینەوەکەماندا هەندێك لە دەقە شیعرەکانی قۆناغەکەدا ئەرکی سۆزدارییان پێ بینراوە، دیارە ئەم دەقانەش جگە لەدەربڕینی هەست و سۆزی خۆشەویستی و رێز گرتن هەندێکیان هەر بەواقیعی کۆمەڵگای کۆمەڵایەتی و سیاسی نەتەوەیی کورد دا بەستراوەتەوە.



## سەرچاوەکان

### سەرچاوە کوردییەکان

### کتێب:


- ئەنجوومەنی ئەدیبانی کورد، ئەمین فەیزی، چاپی دووەم، چ. کاکەی فەللاح لەسلێمانی، ١٩٨٢.
- ئەدەبیاتی نوێی کوردی د. عیزەدین مستەفا رەسوول، بەڕێوەبەرایەتی چاپخانەی فێرکردنی باڵا، هەولێر، ١٩٩٠.
- ئەدەبی کوردی و هونەرەکانی ئەدەب، دکتۆرە شوکریە رەسوول، مطابع التعليم العالي، ١٩٨٩.
- ئەدەبی منداڵانی کورد، لێکۆڵینەوە.. مێژووی سەرهەڵدان، نووسینی حەمە کەریم هەورامی، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردەی هەولێر، ٢٠٠٥.
- پیرەمێرد، پێداچوونەوەیەکی نوێ بەژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی یەکەم، ئومێد ئاشنا، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- پیرەمێرد، پێداچوونەوەیەکی نوێ بەژیان و بەرهەمەکانی، بەرگی دووەم، ئومێد ئاشنا، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- تحفەی مظفریە بەزمانی کوردی و موکری، پێشەکی و ساخکردنەوە و هێنانە سەر رێنووسی کوردی، هێمن موکریانی، چاپی دووەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
- تۆفیق فیکرەت و شاعیرە نوێ خوازەکانی کورد، ئەحمەد تاقانە، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- تێگەیشتنی راستی و شوێنی لە رۆژنامە نووسی کوردیدا، د.کەمال مەزهەر ئەحمەد، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.
- جەلادەت بەدرخان و شیعر، ئازاد عەبدولعەزیز مزوری، دەزگەها سپیژیا چاپ و وەشانێ، چاپخانا (حاجی هاشم) هەولێر، ٢٠٠٦.
- چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، د.کەمال مەزهەر، چ. (الاديب البغدادیە، بەغدا، ١٩٨٥.

- حکوومەتی کوردستان ڕێبەندانی ١٩٢٤، نەوشێروان مستەفا ئەمین، چاپخانەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەولێر، ١٩٩٣ .
- خەبات و ژیان، دلزار ، مطبعة الوفاء، بغداد، ١٩٦٠.
- خوێندنەوەیەکی تازەی هەڵبەستی کوردی، عەبدولڕەزاق بیمار، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
- دیوانی مەلا پەرێشان کرد، گردارندە و ناشر افتح علی حیدری، زیبا جوئی، کرمانشاه، ١٩١٦.
- دیوانی بێسارانی، ئامادەکردن و ساغ کردنەوەی صدیق صەفی زادە، چاپی یەکەم، چ. رستمخانی، ناشر انتشارات کردستان، سنندج.
- دیوانی وەلی دێوانە، کۆکردنەوەی مەحموود خاکی، چاپی دووەم، چ. سەرکەوتن، سلێمانی، ١٩٨٣.
- دیوانی مەولەوی لەسەر بناغەی تێکۆشانی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، پێداچوونەوە و ڕێك و پێك کردن و زیاد کردنی شیعرە چاپ نەکراوەکان، حەسەن گۆران — محەمەد حیجازی، چاپی یەکەم، دەزگای ڕۆشنبیری گۆران، سنە، ٢٠٧٤ کوردی.
- دیوانی رەنجووری، ((مەلا عومەری زەنگەنە))، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەکەم، چ. (آفاق عربیة)، بغداد، ١٩٨٣.
- دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری، چاپی یەکەمین، چاپخانەی هەولێر، هەولێر، ١٩٦٤ .
- دیوانا فەقێ تەیران، سەعید دێرەشی، چ. وەزارەتی پەرەوردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی مەلا عەبدولکەریمی و فاتح عەبدولکەریم، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦.
- دیوانی سالم، عەبدولڕەحمان بەگی صاحبقران، چاپی دووەم، چ. کوردستان، هەولێر، ١٩٧٢.
- دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی سەردار حەمید میران، کەریم مستەفا شارەزا، پێداچوونەوەی مەسعود محەمەد، لەچاپکراوەکانی ئەمینداریتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوانی ناوچەی کوردستان، ١٩٨٦.
- دیوانی شێخ رەزای طالەبانی، عەلی الطالبانی کۆکردنەوە و چاپ کەری، چ. مەعارف، بەغدا، ١٩٤٦.





- دیوانی ئەحمەد موختار جاف، چاپی دووەمین، چ. هەولێر، هەولێر، ١٩٦٩.
- دیوانی ئەسیری، مستەفا عەسکەری کۆی کردۆتەوە و لەسەری نووسیوە، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، چ. (الحوادث)، بەغدا، ١٩٨٧.
- دیوانی کەمالی عەلی باپیر ئاغا، ئامادەکردن و ساغ کردنەوە و پێشەکی نووسینی کەمال عەلی باپیر، پێداچوونەوەی مامۆستا شکور مستەفا، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، ١٩٨٦.
- دیوانی کامەران، پێشەکی نووسین و پەراوێز لێدان، عەبدوڵڵا عەزیز خالد، الطبعة الاولی، مدیریە مطبعة الثقافة والشباب، ١٩٨٨.
- دیوانی دیلان، چاپخانەی (الاسعد)، بەغدا، ١٩٦٩.
- دیوانی شێخ نووری شێخ سالح، ئازاد عەبدولواحید، بەرگی یەکەم، بەشی دووەم، مطبعة الجاحظ، بغداد، ١٩٨٩ .
- دیوانی زێوەر سۆزی نیشتمان، چاپخانەی مەعارف، بەغدا، ١٩٥٨ .
- دیوانی زێوەر، ئامادە کردنی مەحموود زێوەر، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣.
- دیوانی بێ کەس، محەمەدی مەلا کەریم ڕێکی خستووە، چ. (الادیب ) بەغدا، ١٩٨٠.
- دیوانی بێ کەس، چاپی دووەم، ئومێد ئاشنا ڕێکی خستووەتەوە و لێی زیاد کردووە و پاشکۆی بۆ داناوە، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
- دیوانی دڵدار، شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، نووسینی عەبدولخالق علاء الدین، دار آفاق العربیة للصحافة والنشر، ١٩٨٥.
- دیوانی قانع، کۆکردنەوەی بورهان قانع، چاپی شەشەم، چاپخانەی والاهو، تهران، ٢٠٠٥.
- دیوانی هێمن ١٩٢١ - ١٩٨٦، هەولێر، ٢٠٠٣.
- دیوانی حەمدی، ساغ کردنەوە و لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی، جەمال محەمەد محەمەد ئەمین ، چاپی یەکەم، لەبڵاوکراوەکانی چاپخانەی ئۆفسێتی، ١٩٨٤ .
- دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مدرس و محەمەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم، چ. ئۆفسێتی (حسام) بەغدا، ١٩٨٤.

- دیوانی گۆران، سەرجەمی بەرهەمی گۆران، بەرگی یەکەم، محەمەد مەلا عەبدولکەریم، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، ١٩٨٠.
- دیاری مەلا محەمەدی کۆیی، چاپی چوارەمین، چاپخانەی هەولێر، ١٩٦٩ .
- دیلان شاعیر و ئازادیخواز، دلشاد عەلی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨١.
- دیاری کامەران، چ. مەعارف، بەغدا، ١٩٥٧.
- رەنگدانەوەی ئەدەب لە گۆڤاری هاواردا (١٩٣٢ — ١٩٤٣)، عبدالصمد اسلام طە، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.
- رەشید نەجیب ١٩٠٦ — ١٩٦٨ ژیان و بەرهەمەکانی، ئامادەکردنی: ئومید ئاشنا، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- رێبازە ئەدەبییەکان، ئامادەکردن و وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە، د. فەرهاد پیربال، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.
- رازی تەنیایی، ئەحمەد هەردی، چاپی دووەم، چ. بەڕێوەبەرایەتی زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٤.
- رێنیسانس، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، فوئاد میسری کردوویە بە کوردی، چ. الحوادث، بەغدا، ١٩٨٤.
- سیماکانی تازەکردنەوەی شیعری کوردیی (١٨٩٨ — ١٩٣٢)، یادگار رەسوول بالەکی، چاپ ئێکێ، چ. وەزارەتا پەروەردی، هەولێر، ٢٠٠٥.
- سۆسیۆلۆژیای شیعری کوردی لەڕووی پێوەرە ئاکارییەکانەوە، نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم، ئازاد عەبدولواحید کریم، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥ .
- شیعر و ئەدەبیاتی کوردی، رەفیق حلمی، مطبعة التعليم العالي، اربيل، ١٩٨٨.
- شیرین و خوسرەو خانای قوبادی، محەمەدی مەلا کەریم ساغی کردووەتەوە و فەرهەنگی بۆ رێك خستووە و پێشەکی بۆ نووسیوە، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٥.
- شیعری کوردی، ژیان و بەرهەمی شاعیرانی، بەشی یەکەم، د.عیزەدین مستەفا رەسوول، چ. الحوادث، بەغدا، ١٩٨٠.
- قەدری جان شاعیری داهێنەر و نیشتمان پەروەر، ئازاد عەبدولعەزیز مزوری، چ. وەزارەتا پەروەردێ، هەولێر، ٢٠٠٢.





- کاروانی شیعری نوێی کوردی، بەرگی یەکەم، حەمە حەمە ئەمین قادر کاکەی فەللاح، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.
- لیریکای شاعیری گەورەی کورد مەولەوی، ئەنوەر قادر محەمەد، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، ٢٠٠١.
- لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی یەوە، د. مارف خەزنەدار، چ. (المؤسسة العراقية للدعاية والطباعة) بەغدا، ١٩٨٤.
- مەلای جەزیری شتێك دەربارەی ژیان و بەرهەمی، د. عیزەدین مستەفا رەسوول، چ. (دار الحكمە)، هەولێر، ١٩٩٠.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی، چ. معارف، ١٩٥٢.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، لەسەرەتاوە تا سەدەی چوارەم، بەرگی یەکەم، دکتۆر مارف خەزنەدار، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.
- مێژووی ئەدەبی کوردی سەدەکان چواردەم — هەژدەم، د. مارف خەزنەدار، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٢.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، دکتور مارف خەزنەدار، بەرگی سێ یەم، نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم (١٨٠١ — ١٨٥٠)، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٣.
- مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی چوارەم، نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم (١٨٥١ — ١٩١٤)، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤.
- مێژووی ئەدەبی کوردی (١٩٤٥ — ١٩٧٥)، بەرگی شەشەم، دکتور مارف خەزنەدار، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.
- مەولەوی و سروشت، عەلی شێخ عومەر قەرەداغی، چ. کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨.
- مەم و زین ئەحمەدی خانێ، ڤەژاندنا پەرویز جهانی، چاپا یەکێ، انتشارات صلاح الدين ايوبى، ١٣٦٧.
- هونەری شیعر، هۆراس، حەمید عزیز کردوویە بەکوردی، چ. (الزمان)، بەغدا، ١٩٧١.
- هەژار بۆ کوردستان، چاپی چوارەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠١.

- هونەری شیعر (شیعر ناسی)، ئەرەستۆ، وەرگێڕانی لە ئینگلیزی، پێشەکی و پەراوێزی عەزیز گەردی، چ. گەنج، سلێمانی، ٢٠٠٤.
- هۆنراوەی بەرگری لە بەرهەمی چەند شاعیرێکی کرمانجی سەروودا (١٩٣٩ — ١٩٧٠)، د. عەبدوڵڵا یاسین عەلی ئامێدی، چاپی یەکەم، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٥.
- هۆزانڤانێت کورد، دانان و توێژاندنا صادق بهاء الدین ئامێدی، چاپا یەکێ، چ. کۆڕی زانیاری عیراق، بەغدا، ١٩٨٠.
- نەوبەهاری خانی و ئەحمەدی شێخ مارفی نۆدێ، لێکۆڵینەوە و بەراوردکردنی عەلی فەتاح دزەیی، مطبعة الثقافة و الشباب، اربیل، ١٩٨٥.
- وێژەی کوردی و ڕەخنە سازی، پرۆفیسۆر، کامل حەسەن عەزیز بەسیر، چ. (دار الجاحظ)، ١٩٩٠،
- وشە و زاراوەکانی بابا تاهیر و بەراورد کردنیان لەگەڵ شێوەکانی زمانی کوردی، دکتۆر محەمەد نوری عارف، چ. وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٧.
- یادگاری لاوان و دیاری لاوان، ئامادە کردنی رەفیق سالح، لێکۆڵینەوە سدیق سالح، چاپی دووەم، چ. شڤان سلێمانی، ٢٠٠٥.
- یوسف و زلێخا، بەرهەمی خانای قوبادی، بووژانەوە و لێکدانەوەی حەکیم مەلا سالح، چ. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٦.




## نامەی زانکۆیی یەکان


- رۆڵی عەبدولرەحیم رەحمی هەکاری دنویکرنا هوزانا کوردیدا، (ماجستێر)، عەدلە جەمیل ئەحمەد، زانکۆیا دهۆك، ٢٠٠٣.
- رێبازی شیعری کاکەی فەللاح، (ماجستێر)، فەرهاد قادر کەریم، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٦.
- زێوەر ژیان و بەرهەمی، نامەی ماجستێر، **محمد فاضل مستەفا**، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٩.
- ژیان و بەرهەمی سەفوەت، ماجستێر، عەباس سالح عەبدوڵڵا، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠١.
- سروشت لەشیعری گۆران دا، نامەی ماجستێر، فازل مەجید محەموود، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٠.
- شیعری سیاسی کوردی لەخوارووی کوردستان (١٩١٨ — ١٩٣٠)، عەبدوڵڵا ئاگرین، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٤.
- شەقڵی نوێخوازی لە شیعری کوردی و فارسی سەدەی بیستەمدا (١٩٠٠ — ١٩٧٥)، نامەی ماجستێر، محەمەد ئەمین محەمەد نوری ئەمین، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٤.
- کامەران موکری ژیان و بەرهەمی. (ماجستێر)، پەخشان سابیر حەمەد، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٣ .
- لێکۆڵینەوەیەك لەشیعری حەمدی، (ماجستێر)، عەبدوڵلا خضر مەولوود، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦.
- ناوەڕۆکی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەشیعری هێمن، نامەی ماجستێر , عوسمان حەمەد خدر(دەشتی)
- زانکۆی سەلاحەدین، ٢٠٠١.
- دیلان و تاقیکردنەوەی شیعری، نامەی دکتۆرا، دلشاد عەلی محەمەد، زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٩٦.
- دەوری شێخ نووری شێخ سالح لەنوێ کردنەوەی شیعری کوردی دا، نامەی دکتۆرا، کوێستان جەمال سەلام، زانکۆی سەلاحەدین.
- هەڵوێست لەشیعری کوردیدا، نامەی دکتۆرا (١٨٠٠ — ١٩٧٠) قومری سەعید عەزیز، زانکۆی سلێمانی، ٢٠٠٢ .

## رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکان

### رۆژنامەکان:

- رۆژنامەی کوردستان ١٨٩٨ — ١٩٠٢ ژمارەکانی (٢، ٥، ٦،....)
- رۆژنامەی بانگی کوردستان، ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٢٢.

ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٢٢.

ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٢٢.

ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٢٢.

- رۆژنامەی رۆژی کوردستان، ژمارە (٥) ساڵی ١٩٢٢

ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٢٣.

ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٢٣.

- رۆژنامەی ئومێدی ئیستیقلال، ژمارە (١١) ساڵی ١٩٢٣ .
- رۆژنامەی ژیانەوە، ژمارە (١٩)ی ساڵی ١٩٢٥.
- رۆژنامەی ژیان، ژمارە (٢٠)ی ساڵی ١٩٢٦.

ژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩٢٦.

ژمارە (٢٣)ی ساڵی ١٩٢٦.

ژمارە (٢٤)ی ساڵی ١٩٢٦.

ژمارە (٢٥)ی ساڵی ١٩٢٦.

ژمارە (٣٣٥)ی ساڵی ١٩٣٢ .

ژمارە (٣٣٦)ی ساڵی ١٩٣٢.

ژمارە (٣٧٦)ی ساڵی ١٩٣٣.

ژمارە (٨٣)ی ساڵی ١٩٣٣.

- رۆژنامەی هەولێر، ژمارە (٦٤) ی ساڵی ١٩٥٢.



### گۆڤارەکان:

- گۆڤاری بانگی کورد، ژمارە (٣)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (٤)ی ساڵی ١٩١٣.

- گۆڤاری ژین، ژمارە (١)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (١٢)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (١٥)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (٢١)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (٢٣)ی ساڵی ١٩١٣.

ژمارە (٢٥)ی ساڵی ١٩١٣.

- گۆڤاری هەتاوی کورد، ژمارە (٤ — ٥)ی ساڵی ١٩١٤.
- گۆڤاری هاوار، ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٣٢.

ژمارە (١٠)ی ساڵی ١٩٣٢.

ژمارە (١٣)ی ساڵی ١٩٣٢.

ژمارە (٥١)ی ساڵی ١٩٤٢ .

- گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە (٧)ی ساڵی ١٩٣٩.

ژمارە (١١ و ١٢ )ی ساڵی ١٩٤٠.

ژمارە (٥ و ٦)ی ساڵی ١٩٤٢.

ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٤٣.

ژمارە (٢)ی ساڵی ١٢٤٣.

ژمارە (٩)ی ساڵی ١٩٤٣.

ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٤٤.

ژمارە (٦)ی ساڵی ١٩٤٥.

ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٤٦.

ژمارە (٨)ی ساڵی ١٩٤٧.

ژمارە (٩- ١٠)ی ساڵی ١٩٤٧.

ژماره (١٢)ی ساڵی ١٩٤٧.

- گۆڤاری شەفەق، ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٥٨.
- گۆڤاری بەیان، ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٧٠.

ژمارە (٧٦)ی ساڵی ١٩٨٢.

ژمارە (١٢٣)ی ساڵی ١٩٨٦.

- گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات، ژمارە (١٥)ی ساڵی ١٩٧١ — ١٩٧٢.

ژمارە (٢٢)ی ساڵی ١٩٧٨ .

- گۆڤاری نووسەری کورد، ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٧٩.

ژمارە (١)ی ساڵی ١٩٨٥.

- گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٥)ی ساڵی ١٩٨٥.

ژمارە (١٢٣)ی ساڵی ١٩٨٩.

- گۆڤاری وێران، ژمارە (٢)ی ساڵی ١٩٩٥.
- گۆڤاری زانکۆی سلێمانی، ژمارە (١٢)ی ساڵی ٢٠٠٣.
- گۆڤاری رۆڤار، ژمارە (٣٨)ی ساڵی ١٥ / ٢ / ٢٠٠٦.

## دەستنووس:

- میعراج نامەی سەفوەت
- دەست نووسێکی بڵاو نەکراوەی د. دڵشاد عەلی، رێبازی کلاسیکی لە ئەدەبدا، تێروانین و هەڵسەنگاندن.



## سەرچاوە عەرەبییەکان

- اضواء على الادب العربي المعاصر، تأليف أنور الجندي، دار الكاتب العربي، القاهرة، ١٩٦٩.
- اشارات اولية في الشعر التركي، تأليف أز عبداللطيف بندر اوغلو، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣.
- اوربا العصور الوسطى، النهضات والحضارة والنظم، الجزء الثاني، د. سعيد عبد الفتاح عاشور، الطبعة العاشرة، مكتبة الانجلو المصرية ، ١٩٨٦.
- القرآن الكريم في الشعر العربي، الدكتور احمد ابو حاقة، الطبعة الاولى، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٧٩.
- التطور والتجديد في الشعر الاموي، تأليف الدكتور شوقي ضيف، الطبعة الثالثة، دار المعارف بمصر، ١٩٦٥.
- الشعر العربي بين الجمود والتطور، تأليف الدكتور محمد عبدالعزيز الكفراوي، الطبعة الرابعة، دار النهضة بمصر، القاهرة، ١٩٦٩ .
- النقد الادبي عند العرب واليونان معالمه و إعلامه، الدكتور قصي الحسين، الطبعة الاولى، المؤسسة الحديثة للكتاب، طرابلس، لبنان، ٢٠٠٣.
- المذاهب الادبية، د. جميل نصيف التكريتي، الطبعة الاولى، دار الشؤون الثقافية العامة، بغداد، ١٩٩٠.
- الخلاصة في مذاهب الادب الغربي، تأليف د.علي جواد الطاهر، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٣.
- الرومانتيكية، الدكتور محمد غنيمي هلال، دار العودة، بيروت، ١٩٨٦.
- الكلاسيكية في الاداب والفنون العربية والفرنسية، د. ماهر حسن - د. كمال فريد، مكتبة الانجلو المصرية، قاهرة .

- العقد الجوهري في شرح ديوان الشيَخ الجزري، الجزء الاول، تـأليف احمد بـن الملا محمـد الزفنگی، الطبعة الثانيية، مطبعة الصباح، ١٩٨٧.
- العقد الجوهري في شرح ديوان الشيَخ الجزري، الجزء الثاني، تأليف احمد بـن الملا محمـد الزفنگی، مطبعة الرافدين، قامشلي، ١٩٥٩.
- الواقعية في الادب الكردي، الدكتور عزالدين مصطفى رسـول، دار المكتبـة العـصرية، صيدا، بيروت، ١٩٦٦.
- البحتري بين نقاد عصره، صـالح حسن اليظـي، الطبعـة الاولى، دار الانـدلس بـيروت، لبنان، ١٩٨٢.
- التاريخ الاوروبي الحديث من عصر النهضة الى مؤتمر ڤينـا, د. عبدالحميـد البطريـق, الدكتور عبدالعزيز نوارة, دار النهضة العربية, بيروت, لبنان
- الجمعيات والمنظمـات والاحـزاب الكرديـة في نـصف قـرن ١٩٠٨ — ١٩٥٨، الـدكتور عبدالستار طاهر شريف، الطبعة الاولى، بغداد ، ١٩٨٩.
- تأريخ الادب العربي من مطلع القـرن الخـامس الهجـري الى الفـتح العثمـاني، تـأليف د.عمر فروخ، الجزء الثالث، الطبعة الثانيية، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٨١.
- تأريخ الادب العربي، العـصر الجـاهلي، دكتـور شـوقي ضـيف، الطبعـة الثامنـة، دار المعارف، ١٩٧٧.
- ثورة الخيام، عبدالحق فاضل الطبعة الثانيية، دار العلم للملايين، بيروت، ١٩٦٨.
- تأريخ الادب الفارسي، د. رضى شفق زادة، ترجمة محمـد موسـى الهنـداوي، دار الفكـر العربي، ١٩٤٧.
- جمهورية افلاطون، ترجمة الدكتور فؤاد زكريا، دار الكاتـب العربـي للطباعـة والنـشر، القاهرة، ١٩٦٨.
- جولة في شاهنامة الفردوسي، الدكتور بديع محمـد جمعـة، الطبعـة الاولى، دار النهـضة العربية، بيروت، ١٩٧٨.





- فـصول في الـشعر ونقـده، د.شـوقي الـضيف، الطبعـة الثانييـة، دار المعـارف، قـاهرة، ١٩٧١.
- قواعد النقد الادبي، لاسل ابرو كرميي، ترجمة د. عـوض محمـد عـوض، دار الـشؤون الثقافية العامة (آفاق عربية)، الطبعة الثانيية، ١٩٨٦.
- من ادب العصور المتأخرة، الدكتور ناظم رشيد، مطابع جامعة الموصل، ١٩٨٥.
- كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى، تأليف د. كمال مظهر احمـد، ترجمـة، محمـد ملا عبدالكريم ، الطبعة الثانيية، دار آفاق عربية للطباعة والنشر، بغداد، ١٩٨٤.
- كردستان والحركة القوميـة الكرديـة، جـلال طالبـاني، الطبعـة الثانييـة، درا الطليعـة، بيروت، ١٩٧١.
- مذاهب الادب الغربـي و مـضاهرها في الادب العربـي الحديث، تـأليف د. سـالم احمـد الحمداني، مطبعة التعليم العالي، موصل، ١٩٨٧.
- مـدخل الى تـأريخ الاداب الاوروبيـة، د. عمـاد حـاتم، دار العربيـة للكتـاب، ليبيـا، تونس، ١٩٧٩.
- من قضايا الشعر الفارسي الحديث في النصف الاول من قرن العـشرين، الـدكتور بـديع محمد جمعة، الطبعة الاولى، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٨٠.
- مـن روائـع الادب الفارسـي، تـأليف الـدكتور بـديع محمـد جمعـة، الطبعـة الاولى، دار النهضة العربية، بيروت، ١٩٧٨.
- مفاهيم نقدية، تأليف رينيه ويلك، ترجمة د. محمد عصفور، ١٩٨٩.
- نقد الشعر العربي الحديث في العراق من ١٩٢٠ — ١٩٨٥، عباس توفيق، دار الرسالة للطباعة، ١٩٧٨.
- نوبهارا بچوكان، تأليف الاديب والشاعر الكردي احمد خاني، حققه وعلـق عليـه وقـدم له حمدي عبدالمجيد السلفي، مطبعة الرشيد، بغداد، ١٩٩٠.

### گۆڤاره عەرەبییەکان:

- مجلة زانكو للعلوم الانسانيية، العدد (١٠) السنة الرابعة، ٢٠٠٠.
- مجلة الشفق، العدد (٢)، المجلد (١)، ١٥ شباط ١٩٥٨.

### نامه عەرەبییەکان:

- كردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل (١٩١٤ – ١٩٢٦)، رسالة ماجستير، سروة اسعد صابر، جامعة صلاح الدين، ١٩٩٩.

### سەرچاوە فارسییەکان

- ديوان كامل اديب الممالك، فراهانى قائم مقام، تصحيح حواشي و اهتمام استاد سخن وحيد دستكردي، چاپخانه مروى، ١٣٥٤.
- سبك شناسى زبان و شعر فارسي، نوشته محمد تقى بهار، چاپخانه رامين، تهران، انتشارات مجيد، ١٩٧٧.
- سبك شناسى شعر، سيروس شميساه، انتشارات فردوس، چاپ هفتم، تهران ١٣٨٠.
- انترنيت: مجلة الراية http//: www.raya.com/





## خلاصة الرسالة الموسومة

## بوظيفة الشعر في الادب الكوردي (١٩٢٠ – ١٩٥٨)

ارتأت الباحثة في هذة الرسالة طريقة وتحليل جُل الاسس المتعلقة بأهم مفاهيم الشعر وهي وظيفة الشعر و مبتغاه في المراحل المحددة بالحقبة الزمنيية ١٩٢٠ – ١٩٥٨ كون الشعر الكوردي في تلك الفترة اتسمت بالحداثة والتجديد نتيجة للتغيرات السياسية و الثقافية والاجتماعية والتي واكبت تلك الحقبة، وهذه الرسالة بشكل عام تقع في ثلاثة فصول رئيسية تسبقها المقدمة وتختمها الخاتمة.

في الفصل الاول، تسعى الباحثة تحليل وظيفة الشعر في اطار النظريات الادبية السائدة وتخوض في التفاصيل الدقيقة لوظيفة الشعر لدى الامم الاخرى، كالامم الاوروبية والعربية والفارسية والتركية.

وفي الفصل الثاني، والذي يحمل عنوان (وظيفة الشعر في الادب الكوردي في السنوات التي سبقت ١٩٢٠). والسمات البارزة لوظيفة الشعر الكوردي في المرحلة الكلاسيكية بصورة عامة والسنوات التي سبقت (١٩٢٠ ) بصورة خاصة.

اما في الفصل الثالث، والذي يحمل في طياته مبحثين، الاول منه وظيفة الشعر في النقد الادب الكوردي في تلك الفترة المحددة سابقا اما المبحث الثاني عبارة عن طرح النصوص الشعرية في تلك الفترة.

والخاتمة، تنم طرح بعض النتائج بصورة ملخصة التي توصلت اليها الباحثة.

The Research Summary

This letter which is entitled as ((The Duty of Poetry in Kurdish Literature in 1920 – 1958)), is devoted for research about an important basis of the principle of poetry , is the duty and the result of poetry in a brilliant historical stage of Kurdish literature between the years (1920 – 1958) because in those periods Kurdish poetry had been taking a modern style and under the influence of political , cultural and social changes it had stepped forward.

In general the research is divided in to three main parts. The first part is entitled as ((The Duty of Poetry in Literature Theories)) , discusses the duty of poetry in literature of other nations. The second part is ((The Duty of Poetry in Kurdish Literature during the years before 1920)) which is devoted for concentrating on the duty of Kurdish poetry in the classic stage in general and in the years before 1920 in particular. The third part is ((The Duty of poetry in Kurdish Literature in 1920 – 1958)) , contains the critics and Kurdish writers opinions about the duty of poetry and then the brilliant duties that Kurdish poetry had seen at that time , are particularized and finally the important results are put in hands.